کۆشیعری : نیگای دەست
نووسەران : هەندرێن و ئیلێۆنۆرا برو و شێروان خدر و عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا
ساڵ : 2005 ، چاپی یەکەم
نەخشەسازی : شێروان خدر.
تابلۆی بەرگ : تابلۆی هەنار، کۆلاژی هەنار (هەندرێن)
چاپخانە : چاپەمەنی دیلان ، سلێمانی، شەقامی مەولەوی
تیراژ : 1000 دانە



www.terwanin.net
www.handren.tk

## پێشەکی یەکەم:

# شەبەنگی خود لە زایەڵەی نیگاکاندا



ئەم کۆشیعرە، بەدەم دیمانەیەکی ڕاگوزەرەوە، وەک لەرینەوەی ڕەگوزەرانەی شیعر، جیاوازی شوێنکاتی شیعرەکانی ئێمەی لە ماڵی ئەم کتێبەدا نیشتەجێ دەکات. هەرچەندە لە دەرەوەی ئەو ماڵەدا، دووان لە ستۆکهۆڵم و یەکێک لە هەولێرو ئەزیش لە سلێمانی ژیان دەگوزەرێنین. هەر بەدەم ڕاگوزاریشەوە، بۆ ئەوەی شوێنکاتە جیاوازەکان لە زایاڵەی نیگایەکانەوە شەبەنگی خود بە ئاوێنە بکاتەوە، ماڵی ئەو دیمانە شیعرییە بوو بە "نیگای دەست".

عەبدولموتەلیب هەمیشە لە ناو ترسی ئاودا گومڕایی و بێدەنگییەکانی دەتەنێتەوە، "هەندرێن" یش لە ناو شەبەنگی بخووری پاپیەکەیدا ژیان بە تاراوگە دەکاتەوە، هەرچی ڕۆحە بەجێماوەکەی منیشە لە "تانیا"دا، لە هەناسەی مەمکەکانیدا دەبینرێتەوە، "ئیلیونۆرا برو"ش وەک ناونیشانێک بۆ خوێندنەوەی ئێمە لە نیگای دەستی ئەودا شیعرەکانی هەڕمیوە .

ئەم دیوانە لە نیگا پەنهانەکانی خود، لە شەبەنگە ونەکانی "بوون"، لە تامەزرۆییە ترس و رارابیەکانی هەناریی، تاڤگەی رەنگی نیگاکان و لە دەستی ئیلۆدا خۆی ناونووس دەکاتەوە. ئیدی بڕیارماندا، لە خوێندنەوەی عاریفانەی لەپی خۆماندا گومڕابین، بە ریکەوتی ئەو شوێنکاتە جیاوازەوە، بەم زمان و وێنە جیاوازییانەوە، سەری خۆمان بۆ شیعر هەڵبگرین و، نیگای دەستی تریفەیی بە بخوور داگیرساوی کات بسپێرین .

هەڵپەساردنی ناونیشانەکانی تر: شەبەنگی باڵەکان، هەناسەی مەمکەکانی، ژیان ئاوو ئاو دەڕوا، لەگەڵ ئەو تابلۆیە هەنارییەو وێنە کۆلاژییە هەنارییەکەی "هەندرێن"، لە "نیگای دەست"دا، وەک خەیاڵاندنێکی "بوون" تێکەڵ بە رۆحی پەرێشان و کاتی ترازاو و شوێنکە خەمبارەکانمان بێتەوە .

دواجاریش، خوێنەر، دوای ئەوەی کە زانی لە مانا و لێکدانەوە دەقگرتووەکان سەرفراز بووە، دەتوانێت بەشداری ئەو دیمانە شیعرییە بکات، یان راگوزەرانە لە باغچە بچووکەکانی ئەو ماڵە شیعرییەدا لە شەبەنگی نیگایە جیاوازەکانی شیعرەکان رامێنێ، یانیش بە دەم هێوریەکەوە، گوێ لە زایەڵەی شوێنکاتی خودە جیاوازەکان بگرێت.

شێروان خدر
6-9- 2005 سلێمانی

## پێشەکی دووەم:

(1)

(شیعر گەڕانە) ئەوە هەرگیز ناکەوێتە نێو وەڵامی شیعر چییە، چونکە (ئۆگستین)ی مەزن لە پرسیاری زەمەندا دەڵێم ئەگەر نەپرسن دەشێ وەڵام بێ، بەڵام کاتێک ئەو پرسیارە ئاشنایە دەکرێ، راستەخۆ تووشی دڵەڕاوکێ و نیگەرانی و ترسێکی گەورە دەبمەوە.

کەواتە ئەگەرچی ئەو رستەیە مەرجی پێناسەکردنی هەڵنەگرتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ هەموو بەدواگەڕانێک خۆبینینێکی دیکەی شیعر بێ، یان بەرجەستەکردنی جۆرێکی دیکەی ژیان بێ، بەو مانایەش شیعر دەبێتە دەستلێدانێکی دیکەی ژیان.

(2)

(شیعر وردبوونەوەیە) ئەوەی لە پشت ئەو رستەیەوە خۆی دەنوێنێ هەر تەنها بیرکردنەوەیەکی سیستماتیزەکراو نییە، بەڵکو شتێک لە هەرەمەکیەتی

پێیە، بەو مانایەش شیعر لە نێوان وردبوونەوەدا هێلە وەهمییەکانی خۆی دادەمەزرێنێ، بەڵام ئەگەر بتوانین وردبوونەوە بە خەزینە ڕۆشنبیرییەکەی شاعیر ببەستینەوە ئەوە وردبوونەوە ئەو حاڵەتەیە کە شیعرییەتی لێوە هەڵدەقوڵێ.

(3)

(شیعر کەشفکردنە) بێگومان سەرەڕای ئەوەی پرۆسەی کەشفکردن دەمانخاتە حاڵەتی سەرسامییەوە، بەدیوەکەی دیکەش دەکەوینە نێو چێژەوە، واتە ئەگەر بەشێک لەو سەرسامییە پەیوەندی بە توانای وێناکردنەوە هەبێ، ئەوە بەشەکەی دیکە بۆ چێژ دەگەڕێتەوە، ئەو چێژەی کە لە بەرهەمی کەشفکراودا تامی دەکەین، بەو مانایە چەمکی کەشفکردن لە شیعردا دەبێتە ئەو حاڵەتە دەروونییەی کە دواجار لە چێژدا ئارام دەبێتەوە.

(4)

(شیعر دەستلێدانی زمانە بەڵام بە رووتی) واتە خودی ئەو دەستلێدانە، هەرگیز خۆی بە مانا پیرۆزەکانی زمان (بەمانا تەقلیدییەکەی) خەریک ناکات، بەڵکو هەوڵدەدا زمان لە هەموو پیرۆزییەکان رووت بکاتەوە، بەو مانایەش شیعر هەمیشە هەوڵەکانی نووسین پوچ دەکاتەوە، تاکو بتوانێ لە دەرەوەی نووسین جارێکی دیکە خۆی دابمەزرێنێ، بە مانایەکی دیکە شیعر وروژانی نووسینە لە دژی خۆی، ئەوەش دەلالەت لە داڕووتان و خاڵیکردنی زمان دەکات، یان چەسپاندنی نەرگزییەت دەگەیەنێ.

(5)

(شیعر هێرشی هەستە لە مەیدانی خەیاڵ) تێگەیشتنی (هێرش) لە مەیدانی جەنگ و مەیدانی خەیاڵ، دوو تێگەیشتنن کە دەشێ یەکەمییان بە وزە بەربەستکراوەکانی زمان پەیوەست بکەین، بەڵام دووەمییان بۆ ئەو وزە خەفەکراوو متبووانە دەگەڕێتەوە کە لە مەیدانی خەیاڵ (مەیدانی ئازادی) جولە دەکەن.

کەواتە هێرشی هەست لە مەیدانی جەنگ و هێرشی هەست لە مەیدانی خەیاڵ، لە خاڵی ئاسۆییدا بەیەک دەگەن بەڵام لە خاڵی ستوونیدا لێکجیا دەبنەوە.

(6)

(سەرەتا شیعر بوو) ئەوە هەرگیز بەرپەچدانەوەی (سەرەتا وشە بوو) ناگەیەنێت، بەڵکو لەو بڕوایەوە دێ کە مرۆڤ لە درێژبوونەوەی ژیانی شیعردا زیندوویێتی خۆی فەراهەم دەکات، یان بە مانایەکی دیکە شیعر ڕۆحی مرۆڤە، کەواتە ئەگەر پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ یەکێتی وشە ڕۆڵی تیا ببینێ ئەوە ڕۆحی مرۆڤ لە شیعرییەتەوە سەرچاوە دەگرێ.

(7)

لە نێوان شیعرو شاعیردا دوو جۆر بیرکردنەوەو دوو جۆر خەیاڵ و دوو جۆر زمان هەیە، یەکێکیان بە شیعرەوە دەلکێ، ئەویدیکەیان بە شاعیرەوە، بێ

ئەو دوو جۆرە، بێ ئەو بۆشاییە، بێ ئەو دەرفەتە خوێنەری جیاواز لەدایک نابێ.
ئەگەر ئەو دوو جۆرە لە بیرکردنەوەو خەیاڵ و زمانە بکەونە هاوئاهەنگییەوە، واتە پەیوەندییەکەیان ئاسۆی بکەوێتەوە، دەقێکی جیاواز دەخولقێ، بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکە ئاڵوگۆڕی بێ، ستوونی بکەوێتەوە، جیهانبینییەکی دیکە دێتە بەرهەم، ئگەر دەقی جیاواز مانایەکی دیکە بە سیستەم ببەخشێ، ئەوە جیهانبینی جیاواز جۆرێکی دیکە لە سیستەم دەخولقێنێ.

(8)

کەواتە شیعر لە نێوان پەیوەندییە دیارو نادیارەکانیدا، لە نێوان مێژووی وشەو وزە شاراوەکانی وشەدا، لە نێوان خەیاڵی نووسەرو خەیاڵی زماندا، لە نێوان شێوازی جیاوازو جیهانبینی جیاوازدا، لە نێوان چێژو ویناکردندا، لە نێوان هەڵوەشانەوەو بونیادنانەوەدا............. پڕشنگە جوانەکانی خۆی دەوەشێنێ، بەو مانایە شیعر لە چرکەی درەوشانەوە نزیکمان دەکاتەوە.

(9)

(کورد هەموو شاعیرن) ئەگەرچی ئەو وشەیە لە فۆلکلۆر هەڵنەهێنجراوە، بەڵام دڵنیام بیرکردنەوەی پشت ئەو رستەیە لە بەهەڵە تێگەیشتنی فۆلکلۆرەوەیە، من هەرگیز نامەوێ لە بەهای فۆلکلۆر کەم بکەمەوە، بەڵام هەوڵدەدەم لەو هاوپەیوەستبوونەدا فۆلکلۆر لە رێگەی تێگەیشتنی کوردیدا بخوێنمەوە، ئەوەش لەو خاڵەوەیە کە فۆلکلۆر لە دیدی کوردیدا دەخرێتە دەرەوەی عەقڵ و مەعریفەوە، بەو مانایەش لە پشت رستەی ناوبراودا دەیانەوێ بڵێن بونیادی شیعری کوردی

به هەستەوە بەندە، نەک بیرکردنەوەی مەعریفی، کەواتە مانا قووڵەکەی ئەو رستەیە لە یەکسانکردنی شیعرو فۆلکلۆرەوە دێتە بەرهەم، بە دیوەکەی دیکەش واتە فۆلکلۆرو شیعر ئەوەندەی هەستە خەفەکراوو کەبتکراوەکان دەستیان لە وروژاندنی هەیە، ئەوەندە عەقڵ و مەعریفەی تیا ونە.

(10)

دواجار دەمەوێ بە خوێنەر رابگەیەنم ئەو کۆمەڵە شیعرە هاوبەشە لە دەرەوەی رستەی کورد هەموو شاعیرن دەخەینە بەرچاو بەو هیوایەی لە رێگەی جیاوازییەکانەوە بتوانین لە ئاستی زمان و ئاستی چێژو ئاستی وێناکردن و ئاستی شیعرییەت و.......... هتد نزیکتان بکەینەوە.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە ناونیشانی ئەو کۆمەڵە شیعرەوەیە (نیگای دەست) کە ناونیشانی شیعرێکی (ئیلیۆنورا)ی شاعیری سویدییە) راستەخۆ بۆ مانای دەست و نیگای شاعیرەکان دەگەڕێتەوە، بە مانایەکی دیکە هەر یەک لە ئێمە لە شیعردا لە هەوڵی ئەوەدایە کە لەرێگەی دەستی خۆیەوە نیگاکان بنەخشێنێ، هەروەک چۆن لە رێگەی نیگای تایبەت بەخۆیەوە دەستی شیعر تا ئاستی چێژو نواندنی هونەری بەرز بکاتەوە، بە کورتی دەمەوی بڵێم ئەو ناونیشانە تەنیا ناونیشانی تاکە شیعرێک نییەو بەس، بەڵکو ناونیشانێکە خۆمانی تیا دەبینینەوە، بۆیە بڕیارمان لەسەرداو کردمان بە ناونیشانی سەرەکی ئەو کۆمەڵە شیعرە هاوبەشەمان.

**عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا**
**هەولێر**

## رەقییەك لەگەڵ نەرمیدا دەپەیڤێ

من بوونەوەرێکی درەوشاوەم، تا ئەم بۆشاییە رۆشن بکەمەوە، کە لەبەر چاومدا پەرژبۆتەوە، لەناو ئەم بۆشاییە شلەژاوەدا دەمەوێ مانایەک بەم بوونەوەرە ببەخشم، کە ئەوە منم، پەرێشانییەکی کۆنینە لە ناومدا دەژی. خەونێکە خەونم پێوە دەبینێ و دەخوازێ شوێنێک لە کەناری ئەم جیهانە دابهێنێ.

بەدەم ئەم خەونەوە لە لێوارەکەی ئەوبەری جیهاندا بەرەو رووی رووبارێکی شلەژاو رێدەکەم بەمە دەمەوێ بە هێمنی لەم بوونەدا بژیم.

ئەم بوونەش شیعرە، شیعریش ناسنامەیە، ناسنامەش زمانە، ئەم زمانەش خەیاڵ، بیرڕۆیی، تەقینەوە و ئاوازەکانی ناوەکییە.

وەک ئەوانی تر دەخوازم لە ئاوێنە ناوەکییەکانی زماندا خۆم ببینم، کە زایەڵەی رۆح و زرینگانەوەی یادەوەرییە.

دەخەوم تا خەون ببینم، دەپرسم تاکو خۆم و ئەوانیتر بناسم. سەفەر بۆ دۆزینەوەی خۆم و زانیارییەکان دەکەم.

ئێستا من لێرەم، لێرەی بێ شوێن. شوێنێک کە وەک ئەوانیتر و وەک خۆی بانگم ناکات. پەیوەندی نێوان من و ئەو شوێنە، پەیوەندییەکی سومبلییە، یان بە زمانێکی نەبیستراو لەگەڵمدا دەپەیڤێ.

کاتێ شوێن بە "هەندرێن" بانگم نەکات، واتا من دەبمە راناوێکی نادیار، دەربڕینی نادیار. بۆیە من دەبم بە بوونەوەرێکی ون.

کە تۆ ئاشنا نەبوویت، واتا تۆ ناسنامەیەکی نادیاری لەم شوێنەدا. بەمجۆرە لەسەر رووی بۆشاییدا وەک سەراب دەجمجێم، نەبینراوانە گنگڵ دەدەم و لە گوتنێکی نەبیستراودا جێگیریم، واتا بە زایەڵەی شیعرەوە بەرەو مەوداکان خلۆر دەبمەوە. بە شیعر لە ناخی شەپۆڵەکاندا دەژیم. شەپۆلی ماوەکانی نێوان دەرەوە و ناوەوە، یان لە دیار و نادیاردا دەژیم.

لێرەدا تەنیا ژن بوونی هەیە. ژن و شیعریش ویستێکە بەرەو شوێن تەکانم پێدەدا و بۆنی بوونم پێدەبەخشێ. لێرەدا ژن: مێیایەتی شوێنە و نەرمی رۆناکیم پێدەبەخشێ. شیعر بەرجەستە کردنەوەی ئەم جەستەیە.

بەواتایەکی تر شیعر بەرجەستکردنەوەی مێینەیی شوێنە. کەواتە ژن و شیعر لەسەر خاکێکی بێ شوێندا عەدەمێکی ترە... ئەم خاکەش بێ رۆناکی جەستەی ژن نابینرێ. ژن، لێرەدا راکێشانی نەرمییەکە کە رەقی دەبزوێنێ. ئەمەش ئازارێکی بەردەوام، چرپە چرپی تاراوگەیە و بە چوونە ناو ئەو جەستە نەرمە نەبێ ناوەستێ، کە جەستەی ژنە.

بەمجۆرە زەمەن دوور دەکەوێتەوە، دەکەوینە دەرەوەی زەمەن، کەواتە لێرەدا شیعر دەبێتە پەیڤین لەگەڵ زەمەندا: نێرینە لەگەڵ مێینەدا. دواجار شیعر و نووسین ئاوەڵاکردنی خودە تاکوو بە جەستەی رۆح ئاشنا بن، یان بوون و شوێن ببن بە یەک.

من تا ساڵی 1981 ناوم مەهدی بووو لە هەولێر دەژیام. لە دوای ساڵی 1981ەوە تا ئەمرۆ لە شاخەکانی کوردستانەوە بوومە پێشمەرگەو "هەندرێن" بوو بە ناوی کۆتاییم. لە هەولێر سەرەتا دەستی پێکرد، لە

شاخەکانەوە تا ئەمڕۆ لە شوێن ورد دەبمەوە. هەشت ساڵ بە پێشمەرگایەتی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق مامەوە. پاش تێپەڕین بە قەدەری سەربازگەکانی تورکیاو ئێران پێیەکانم پاسەپۆرتم بوون. بەم پێیانە لە عێراقەوە سنووری رووسیام لە 1990 بڕی و ماوەیەک زیندان بووم و ماوەیەک بە چاوەڕوانی لە رووسیا مامەوە، کۆتایی 1990 بۆ یەکەمجار سواری فڕۆکە بووم، بەڵام بە قاچاغ گەیشتمە سوێد. ئەوە لەو کاتەوە لە ستۆکهۆڵم دەژیم. ئێستا لە زانکۆی سدیرتۆرن لە ستۆکهۆڵم دەخوێنم و پلەی ماستەر وەردەگرم. سکاندیناڤیا: دوورگەیەکی تر لە بخوور، کۆی شیعرەکانمە و ساڵی 1996 بە کوردی و ساڵی 2004 بە زمانی سوێدی چاپکراوە و دەنگی من بە ئاوێنە دەکەنەوە.

## یادوەری ماڵ و گەڕیدەیی تاراوگە

## زەمەنە سەرابییەکانی سەر پشتی مانگایەک



1

*لەوێ*، لە جوگرافیای خەونەکاندا، دونیا دەنگێک بوو لە ئەفرێنەرێکی جادووگەر و ژیانیش وێنەیەک بوو لە سێبەری خوا. حیکایەتەکانی دایکم بەوە فرچکیان دام کە زەوی لەسەر پشتی مانگایەک راوەستاوە، لەوێ *ئاسمان ماڵی* خوا بوو. نە کات چرکەی هەبوو نە دەقیقەش، یەکایەتیەک بوو زەوی و *ئاسمانی* پێکەوە ئاوێتە دەکرد.

................................ نیگای دەست

لەوە دەترسام کە ڕۆژێک مانگاکە غەزەب بگرێ یان نەساغ بێ و ئێمەش بکەوینە ناو دەریا و بۆشایی و وێڵیەتی قووتمان بدا.

وێنەی ئەو مانگایە لە مەزەندەمدا هێندە قەبە بوو کە نیگام بەخۆیەوەی نەدەگرت. بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەو بوونەوەرە نە گەیشتم، کە حوکمی بەسەر ئەو گەردوونەدا دەکرد و، گەورەییەکەی چاوەکانمی تەنیبۆوە.

هاودەم لەگەڵ هەنگاوی تەمەنمدا، سۆراغی ئەو ڕۆژە چاوەڕوانکراوانە پتر دەبوو.

هەمیشە لە دایەم دەپرسی: گەر هات و ئاسمان بەسەرماندا بڕمێ، مانگاکە چی بەسەر دێت؟ گەر هات و زەوی لە ژێر پێماندا هەرەس بێنێ، ئەو جا ئێمە چی بکەین؟ دایکم هەموو جارێ یەکسەر پرسیارەکانی پێدەبڕیم و بە تووڕەیی و پەشۆکاوییەوە ناچاری دەکردم تۆبە بکەم بەرانبەر خوا.

منیش بە دڵی کەیلمەوە دەچوومە دەرێ، هەتا نیگای چاوەکانم بەرەو چیایە دوور و بڵندەکانی ئەم چۆڵستانە کۆچبکەن، کە تەمە سپییەکان لەسەر لووتکەکانیان، وەک باڵەکان بەسەر بەرزاییەکانەوە بەرەو ئاسمان و زەوی باڵیان دەگرت. هەر دەتگوت پەری چیاکانن و بەسەر لووتکەکانەوە هەناسە دەکێشن. لە شەوە ئەنگوستە چاوەکانی زستانان پەرییەکان لەگەڵ –با– دەوە دەهاتن و دەخزانە نێو گوندەکەمان. هەمیشە بەدەم دەنگی ئەو بارانەی کە لە سولاوکەی خانووەکەمانەوە دەڕژا، بە دڵەراوکێوە خەو دەیبردمەوە.

ڕۆژارێکی درێژ وامدەزانی کە ئەوە دەنگی پێیی فریشتەکانە کە بە سولاوکەکانەوە دیانەوێ بێنە لام.

ئەوها، بە خەون و ختۆکەی ئەو هەستانەی کە حیکایەتەکانی دایە پێیدەبەخشیم، شەوەکان رادەبووران.

## 2

*لێرەوە*، لەم شوێنکاتە بێخەون و رووتبۆوەیەدا، منداڵیەتی هەراسانم، وەک ئەستێرەی گەلاوێژ و کاروانکوژە لە یادوەریە خۆڵەمێشەکانمەوە بەرەو تاراوگە کۆچدەکا.

ئەوکاتانەی کە ئەستێرە راڕایەکان لەودیو شاخەکاندا بێدار دەبوونەوە و ترۆپکەکان لەناو خوناودا دەتریسکانەوە و کاروانچییەکانیش سەرخەویان دەکێشا.

خەیاڵاندنی ئەستێرە و کاروانچییەکان دیمەنێک بوون کە تەمەنی ئاوەزی من درکیانی نەدەکردن.

ئێوارانی هاوین، بەر لەوەی بەزۆری بەرەو دەنیای خەو بچم ، لەسەر جێگایەکەم رادەکشام، ئەو ئەستێرانەی کە دایکم بە چرای خوا ناوی دەبردن، بڕژێنە ناو چاوەکانم و بکوژێنەوە، بۆ میز کردن دەچوومە دەرەوەی حەوشەکەمان.

بەدەم میز کردن و کرفەی زاری وشکی زەوییەوە، دڵخۆش دەبووم بە شکاندنی تێنوویێتی تەریفەی  خاک. هەنووکەش هەستدەکەم زەوی بوونەوەرێکی تێنووی تەریفەیە، هەنووکەش  بۆنی خۆڵەپۆکی زەوی و چۆڕەی میز  لە ناخمدا دەنگدەداتەوە.

3

*لێرەوە*. لە ئێوارەی تەمەندا بیرەوەرییەکانی زاڕۆکایەتی وەک گەردەلوولێکی بەر سۆرەتاوی هاوین غلۆر دبنەوە و بە پێخواسی سەما دەکەن و سووڕ دەخۆن و بەناو ماوەکانی دارستانەکانەوە دەگەڕێنەوە.  بەدەم  غلۆر بوونەوە وە چەپۆک لە سێبەری هەورە خەوڵووەکان گیر دەکەن و زەوی  تێنووی کەسیرە رادەچڵەکێنن.

## ......................... نیگای دەست

شەوانە لەسەر بانی خانووەکەمان دایکم داستانی ئەستێرەکانی بۆ دەگێڕامەوە: کاروانکوژە، حەفتەوانە و پێڵوتەرازوو ... وایانلێدەکردم کە ئاسمان وەک دونیایەکی دڵکێشتر لە هی خۆمان ببینم. ئەو شەوانەی کە ئەستێرەکان وەک باران دایاندەکرد، چاوەکانم دەقووچاند. نەخۆ بڕژێنە ناو چاوانم. کاتێ ئەستێرەکان دەکشان ، دایە دەیگۆت: "ئەیەڕۆ ئەمشەو دەبی پیاوچاکێک عەمری خوای کردبی، یان پێشهاتێکی شووم روویدابی. پاشان  پێی دەگوتم:" کوڕێژگە وسکت بە و ئاگات لە خۆت بی.

ڕێی کاکێشان کۆچێکی لە کات بەدەر بوو. دایکم ئەنگوستی لۆ ڕەوانە دەکرد و دەیگۆت: "تەماشای ئەوێندەرێ بکە، ئەوە هەموو کای ڕژاوی کۆچبارەکانە."

وامدەزانی ڕێی کاکێشان پردی نێوان هەموو دونیا و ئاسمانە. ئەو ئەستێرانەی کە لەوێ خۆیان بەژێر ئاسمانەوە هەڵواسی بوو ئەو مرۆڤانەن کە بەدەمرێوە کۆچدەکەن.

هاوینان جاروبار مانگ دەگیرا، وەک ژنێکی رەشتاڵە بە ئاسماندا تلدەبۆوە. جا دایە دەگریا و دەیگووت: "ئەوە رووی مانگ رەشهەڵگەڕا، دەبێ خراپەکاریەک لە دنیایێ قەومابێ". لە هیکڕا دەستی دەکرد بە سەردولکە، پەیڤ و ئاوازەکانی وەک شەپۆڵێکی حوزنبار بەنێو شەو و بێدەنگی مندا پەرش دەبوونەوە. جەستەی ساوایای منیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت.

ترس گیانی دادەگرتم و لەسەر بانی خانووەکەمانەوە بەسەر قاندرمەکانەوە دەچوومە خوارێ. بەنێو شەودا بەرەو لای دەروێشە حاڵگرتووەکان غارم دەدا. لەگەڵ منداڵە هاوئاوزەکانی خۆم بە دوەری بازنەی دەروێشەکان رادەوەستاین.

لەگەڵ راوەشاندنی پرچی درێژیان، وەک تەم بەناو هەوای شەودا پەرژ و بڵاو دەبوونەوە. یەکێکیان بەدەم هاوارەوە زەرگی لە خۆی دەدا و ئەوانی دیکەش شووشە و گلۆپیان دەکرۆژی. ئێمەش چاومان زەقدەبۆوە و لێک نزیکتر دەبووینەوە. شەو دەبووە

کەرنەڤاڵێکی خودایی، دەبوو بە نوێژێک، هەتاکو خوا مانگمان بۆ ئازاد بکاتەوە. کەچی مانگیش بە رووخساری خەمۆکی ژنانەیەوە، بە هەنگاوە قوڕسەکانی ، نیگای تاریکی لە ئێمە دەبڕی. لەوێ لەسەر بانیماڵەکەمان دایکم گازی دەکردم.

لە ئێوارەی تەمەنەن و تاراوگەدا، نە ئەستێرەی گەلاوێژ و نە حەفتەوانەشم لە مالی خوا لێ دیارە، نە دەنگی هاواری مانگا، دایکی زەوی دەبیستم.

4

لەوێ، لە جوگرافیای خەونەکاندا، هەتاو دوا تیشکەکانی بەنێو دارهەناری ناو باغچەکەی بەر مالمان پەخشدەکردەوە. زەردەپەڕیش وەک پرشنگی ئاگرێکی ددانەدار سنگ و بەرۆکی ئاسۆی دەلێستەوە.

درەخت و رۆناکی هەموو رۆژێ بەر لە ئاوابوونی خۆر بەدەم رامووسانەوە یەکتریان لە ئامێز دەگرت.

منیش لەگەڵ گوڵاڵە سۆر و زەرد و پەمەییەکان گەمەم دەکرد.

گوڵنارەکانیش ، وەک گوڵئەستێرە بەنێو درەختەکاندا بەڵەفڕێیان دەکرد.

رەنگە باران و گەڵایەکان لە دوورڕا پێکڤە سەما بکەن.

دایکم دەهاتە دەرێ و گازی دەکردم: " وەرە ژۆرێ شیو بخۆ". لێ نەدەچووم هەتا کەروێشکەکان دەچوونەوە ناو کولانەی هێلانەکانیان.

بە رەنگی پاییزیمەوە دەگەڕامەوە ژوورێ و دایکم کۆلکە دارەکانی ناو سۆپەکەی گڕدەدا. من و خوشک و برایەکانم لەبەر سۆپەکەدا خۆمان گەرمدەکردەوە. من بە چیلکە دارە داگیرساوەکان گەمەم دەکرد. دایکم چەپۆکێکی لێدەدام، تاکوو وەک خوشک و برایەکانم کڕ و بێ عەجولی بسەکنێم.

وەلێ من زیاتر لامیلم دەکرد و دەغەزریم. نابێ بە ئاگر و ئاو گەمە بکەی. دایکم با ئامۆژگارییەوە چیلکە دارە داگیرساوەکەی لە دەست دەردەهێنام و دەیگوت؛ ئاگر کیژی زەوییە و ئاویش ڕۆناکی ژیان و ئاوەدانییە. بێدەنگییەک بەسەر لێوکانم دەنیشت.

منیش بە شەرمەوە چاوم دەبڕییە ئاگرەکە. کە تاریکی تیشکە خۆڵەمێشییەکانی بەسەر ئاسۆ و زەوی و ماڵەکەماندا رادەخست، دایکم دەهات و حیکایەتەکانی بۆمان دەگێڕایەوە، کە من لەناویاندا نقووم دەبووم. هەموو جارێ لە دایکم دەناورامەوە ئەو حیکایەتەم بۆ بگێڕێتەوە، کە خەڵکی بەسەر دوو دەنیادا دابەشدەکرد؛ خێر و شەڕ:

"هەبوو نەبوو دێوێک هەبوو، دێوەکە فریشتەیەک بوو لەگەڵ فریشتەکانی دیکە لە کن خوادا دەژیا. دێوەکە کارێکی خراپەی کردو خواش غەزەبی لێگرت. دێوەکە زۆر لە خوا پاڕایەوە تا لێی خۆشبێ. بەڵام خوا ئاوارەی جەهەنەمی کرد. دێوەکە لە جەژمەتدا ئاگری



## نیگای دەست ..............................

جەهەنەمی بە فرمێسکەکانی کوژاندەوە و لە ئێش و دەرد قووتار بوو... لەبەر هەندێ دەگێڕنەوە، دێوەکە هەر جارێ کە داوە مووەک بسووتێنێ، واتا ئەو بەمە کەسێکی لێقەوماو دەستکورت، لە خەم و خەفەت قووتار دەکات..."

من بووم *لەوێ*، لە زەمەنە سەرابییەکانی سەر پشتی مانگایەکدا، لە ئامێزی حوزنباری دێوێکدا، دەژیام.

31. 10. 1997

ستۆکهۆلم

## یادێکی پاییزی - Årsta

شوێن سێبەری مرۆڤە، لە هەرکوێییەک بین لەوێدا ئامادەیە. لێ ئامادە بوونەکەی، ئامادەبووبێکی ناوەکییە، نەک وەک کات کە ئامادە بوونێکی دەرەکی رێژەیی هەیە. شوێن میانەیەکی نیگا ئاسای هەیە و لە یادوەرییدا ئەتمۆسفێرێکی زیندوو بەجێدێڵێت. کەچی کات بۆ مەزەندەکان وەردەچەرخێ.

پاییز لە شەوێکی پاییزی سەرابی دەچوو، کە گەیشتمە سوێد. وەک رێکەتێک لە هوتێلی "ئەلفا" دا خۆم دۆزیەوە، ئۆردوگایەکی پەنابەران بوو، کە پڕ بوو لەو خەڵکانەی کە لە هەموو گۆشەیەکی جیهانەوە هاتبوون. رۆژەکان وەک هەوری پایزێکی نامۆ و سەفەر کردوو

تێدەپەڕین. من و پەنابەرەکانی تر وەک گەڵا وێڵەکان بە دەوری هوتێلەکە پیاسەمان دەکرد.

لە سپێدەکان تەمتومانی پاییز بە باڵای درەختەکان دەئاڵا و گێژەنی با، وەک بیرهاتنەوەکانمان بە راکردن و سەما ئاساوە، لە دوورڕا بە نێو دارستانەکەی گەڕەکی "ئۆشتە" وە، هەڵیدەکرد. شەقامە نامۆیەکان هەنگاوە برسییەکانی ئێمەی بەرەو قەراغ کەنداوەکەی "ئۆشتە" پەلکێش دەکردن. لەوێڕا بە بناری دارستانەکەوە بەرەو سەرکەنار دەچووین، کە درەختەکان بە رووخساری چڕ و بێدەنگیانەوە رووەو بووڵێڵ دەچەمانەوە. بەدەم سەوڵ لێدانی مانگ بە نێو کەنداوی ئۆشتە وە، ماسییە چکۆڵەکان لە چاوە هەنگوینییەکانی مانگ هەڵدەبەزینەوە. لە دوورەوە پردە درێژەکە، بۆ تەوقە کردن بەسەر کەنداوەکەی "ئۆشتە"وە دەستی درێژ کرد بوو.

................................ نیگای دەست

تەمەن ئێوارەیەکی پاییزی بوو، تەڕی هەوا و بۆنی یادەکان ختۆکەی گۆنای پاییز و ڕۆناکییە رووتەکەی ئەمدیوی پەنجەرەی ژوورەکەمی دەدا. ڕۆناکی چراخانەکان لە ئامێزی تەمومژەکەدا، بە دەم وەنەوزەوە وڕێنەیی دەکرد. لەوبەری شەقامی "ئۆشتە"دا پیرێژنەکەش هەمیشە بە نازەوە بانگی توتکە سەگەکەی دەکرد. دیواری خانووەکان، ئاسمان و زەوی هەمیشە بێدەنگ، مرۆڤە تەنیایەکانیش کە بە خێراییەوە بێدەنگ بە تەنیشتمانەوە دەگوزەران، ئەوانیش تەنیا. چوون بۆ سوپەرمارکێتی "ئیکا" و "کۆنسۆم" خۆشترین شت بوو بۆ ئێمە. تەنیا لەم دوو دوکانەدا مرۆڤ دەیتوانی لەوێدا زۆرترین خەلک ببینێ، ڕەنگە لەوێش مرۆڤ بیتوانیبا لەگەڵ کچێک ئاشنا بێ. بە ئنیگلیزیەکی پێکەنیناوی لەگەڵ خەڵکیدا دەستمان بە قسە و گاڵتە دەکرد.

گۆڕەپانی "ئۆشتە" لە دەریاچەیەکی وشکەڵاتوو دەچوو، لەوێدا دادەنیشتین و سڵاومان لە هەموو ئەوانە دەکرد کە بەوێدا

تێدەپەڕین، کەچی تەنیا سەگەکانیان  هەندێ جار ئاوڕیان لێدەدایەوە و لێمان مۆڕ دەبوونەوە.

بە رەستورانی "یەلمەش"مان دەگوت مزگەوت. هەموو رۆژێ لەو رەستورانەدا بە دیمانەی هەمان ئەلکهولیستەکان دەگەیشتین.

هەر ئەوانیش بوون کە ئێمەیان دەبینی، بێئەوەی لە یەکتر تێبگەین، دەستیان بە گاڵتە و قسەکردن دەکرد.

کات ئێوارەیەکی پاییز بوو، لەناو دارستانەکەی "ئۆشتە" کە درەختەکان یەک بەدوای یەک راوەستا بوون، هەندێکیشیان بە رووتی بەرانبەر یەکتر نووشتا ببوونەوە. بۆنی پاییز لەگەڵ یادەکاندا لە زەوییەکەوە پەرژ دەبۆوە؛ ئێمە لەوێ لە باغی شارەکەمان، بە دزییەوە ژوانمان دەگرت، تا لە چاوەکانی یەکتر نقووم ببین.

8.6.1997

## لەمدیو جەستەدا گەڕیدەیەک بە رووتی

1

بۆ ناو بینایی خۆت داچیتەوە: سەرسام دەبی،

هەوری زەردەپەڕێکی خڵتاو لە نیگەرانی ئاوابوون، لێتدەئاڵێ.

لە رەگەزێ گەواڵە دەستنووسێک لە پڕیشک،

وەک بەیادهاتنەوەیەکی تالانکراو هەڵدەدەم.

هەڵچوونەوەیەک لە دایک دەبێتەوە،

ئەستێرەکانیش لەسەر پێڵوی یادەکانت دەنیشن و

بەدەم بۆرژانەوە لەناو ئەو رۆژە خۆشانە خەندەیان دێ،

کە کاتیشیان نزانرێ.

دەچمەوە ناو هێوریتەوە:

لە گۆشە دوودڵنشینەکانی چاوتدا مۆمەکان بێدار دەکەمەوە.

بەسەر باڵی گێژەنێ سەرمەست دەبم و

گۆرانیەکانی دەم باران دەنووسمەوە.

گەر دەگەڕێتەوە لە کۆتاییەک،

نایێتەوە سەرەتایەک.

بەچی سەرەتایەکان داگیربکیەنەوە؟

ئەو پەنجەرانە بۆ رۆژگاریان لەسەر خۆدا داخستووە؟

دەرگای ژیانێکیش سارد دەڕوانێ و

بێ ورتە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پشیلەیەک دەدا.

بۆناو بینایی کۆچدەکەیتەوە: جەستەت دەمەێ.

ونبوونێک بە پچڕانەکانی ئامدەتدەکا.

## نیگای دەست

رادەچڵەکێم!

جەنگەڵستانێکی پیر سەرتدەکا بە مەشخەڵ و

پەلکێشتدەکا.

پەنگدەدەیتەوە،

بە راکردن یادەوەریت لێکگرێدەداتەوە.

گیانت لە باوەشی خۆتدا توند بگوشە

تا دەبی بە هەور و بەناو لەشی خۆتا دادەبارێی.

بۆناو بینایی خۆت دەچیتەوە: کپییەکی پاش لە دایکبوونەوە،

یان کەژێک وەک دوا ماڵئاوایی

سەر زەمین دەلاوێنێتەوە.

منداڵێکە: بروسکە لە ئامێزدەگرێ و

لە یاری شەوێکدا لە ماڵ دەتۆرێ.

منداڵێکە: لە کۆچێکدا گۆرانی بۆ ئەو کیژە دەهۆنێتەوە،

کە لەبەر بەفرا کەزییەکانی بۆ بڕی.

منداڵێکە: لە خەوندا تریفەی مانگ لەسەر چاوەکانی پایزێک

گلدەداتەوە.

منداڵێکە: دەخوازێ میوەی هەقیقەت بە کۆتایی ئەم کۆچە

ببەخشێ.

منداڵێکە: لە تێڕامانە گوناهەکانی خێر و شەڕ،

لە ئەڤینێکی بە کات نەگیراو،

چێژ دەنۆشێ.

مەرگ بۆ پەیژەکەی رایەڵدەکا؟

ژیان رەنگ تاڵانە بۆ وا بە مەرایی لە خۆشە_ویستی دەڕوانێ؟

لەم کۆچەدا بەم گڕی خەم و بەم دڵی چرایەتەوە،

کاروانێک لە نوور دەستپێبکا:

یان دەسووتێی،

یانیش دەبییە شەبەنگێک لە مانا!

بۆناو بینایی خۆت دەچیتەوە.

بێهوودە لەژێر درەختێکی جادووکەر دەنیشتم و

بەختەکانم بەرانبەر خۆم کەڵەکە کرد،

ئازادییەکم قووتدا و بە تێنووتییەکی تەریفە لە مرۆڤ رام.

ئیتر بە ئاکامێک لەکێشوەری ئاسکەکان هەبوونێکی دوونەیم

ژیاندەوە،

بە بینین نەدبینرا.

گەردوونیشم لە دوورگەی ماسییە بەوهیمیەکان، بە گێژەنەکانی

سەراب رازاندەوە.

وێکڕا لەشکری تەفروتوونامان لە زەریا خواست.

لە جوگرافیای زریاندا شتێک لە وێنەی ئاگایی جیایکردینەوە لە

یەکتر.

دیسان تەنیا ماینەوە، وبۆ یەکتر کتێبی پێشبینیمان خوێندەوە.

میوەی حوزن لە باڵاماندا دەڕسکا.

منیش لە روانین بترازێ، چیترم نیە بۆ هاتن.

لە دۆشداماویدا حەزمان لێدەڕوێ.

لە ماڵی چۆڵەکە، لە هەوا، لە مەکری جاڵجاڵۆکە و لە فراژانی

جەنگی ناو خودەوە،

غەریزەی هۆگر بوون بە سەرکەوتن تاقیدەکەینەوە.

لێ پەیژەکان بە دڵە لەرزێ رێنیشاندەری بۆ هەڵزنانی

ماخولیایەکانمان دەکەن.

بە رەگی گەڕانەوە داوێنگیر دەبین.

بۆ چوونە ناو یەکتر رۆشنایی بەشمان ناکا و

پەشۆکاو لە خۆمان و لە ناسیاوە دوورەکانمان،

نیگای دەست ..............................

لە پۆلە کۆترەکانی پەرێشانی دەپەیڤین.

دەچیە ناو فەرامۆشیتەوە، شەپۆلێک وەک لەشێکی لە ئاگر
لە گەرووەمەوە بۆناو زارمدا گنگڵدەدا.
ژانێک لە خوێندا دەرژێ.
لە زمانی بڵێسەدا خامۆشییەک شکۆفە دەگرێ.
بێدارم دەکەیتەوە و لە خۆر رادەمێنین.
خۆمان بۆناو تاڤگەی تیشکەکان تورڕدا و
گۆرانییەکانت بەشی پەرێشانییە فەرامۆشەکانم ناکەن.
منداڵێکی پێخواس گەڕیدەیەکە و لە هەوری خەونێکدا بە رووتی،
وەک گەواڵە بە نێو بیرهاتنەوەکاندا سەرهەڵدەگرێ.
جەستەم دەبێ بە درەختی تەم و
دەمارەکانیشم بخوورێکە بە ورێنەی کۆچەکەم دامدەگیرسێنێ.

## 2

دەچیتەوە ناو رامانی خۆتەوە: بەدەم جەمسەری زەمانێکی

لێکدادڕاساو،

قەدرەکان تاقیدەکەمەوە، کە بە تابووتەکانی رابردوویەک

مەرامگازم دەکەن.

هاوارێک لەمدیو شەپۆڵەکانی بێدەنگی دەتەقێتەوە و

رەشەبای سوارێک لە جەستەمدا هەڵدەکا.

لە مەزەندەکانەوە زایەڵەیەک رامدەوەشێنێ.

لە خۆمڕا دەوروبەر تەیدەکە، هەڵچوونەوەیەک لە دایکدەبێتەوە.

هەموو شتەکان، بەو خۆشەویستیە لە کات دەرچووانە تۆشەوە

لەسەر ئەو وێنە هەڵکوڕماوانەی، کە شوێن دەیووروژاندن،

نە نەخشاند.

بۆ لەو دووڕیانە بوڕکانێک لە ئاژاوە ناخولێ؟

................................ نیگای دەست

بۆناو هێوریت دەچیتەوە: پەڕی ئەو تاوسەی کە گوڵی حوزنی دەگرت،

تیریژی

بە کۆچێک سەرهەڵدەگرم و

نادیارتر بمنوێنە، ئەی بینایی، نادیارترا

نادیارتر کۆچبکە، ئەی منداڵییەتی، نادیارترا

1997

ستۆکهۆلم

## ئاوێنەیەک لە بری سەمای ئاگر

1

زەمانێک بە گێڕانەوەی ئەو هەموو بورجانەی کات و پەیامە

سەرابییانەی هەوڵ کۆچ

ئامادەتدەکا و لە گێژەنی پلووسکدانەکانی:

دەتنووسێتەوە،

هەڵتدەگرێ و

لە بینایدا دەتنەخشێنێت.

سەوداسەر لە زەماندا دەتدوێنێت:

مەزرای گوندەکان، وەردیانی دیرۆکێکە و

غەریزەی یادوەریش لە مەوەتەنی خەوننامەیەکدا.

ئەستێرەیەکی کلکدار.

## نیگای دەست ..............................

بە تەمتومانی ئەو کێوە کۆستکەوتوانە سووڕیدەخوارد؛

دادگیرسا و

باڵیدەگرت.

لەوێڕا، چەکدارەکانی قەدەر بە دەستە ئەهریمەنەکانیانەوە،

چەپەری هێرشیان والا دەکرد لەبەردەم لەشکری ڕەشەبایەک.

سەگاکانیش، بەر لە خانەخوێیەکانمان، بەدەم بانگی کێوەکانەوە،

لە هەڵمژینی تەمێکی تاراوە بەرەو دامێنی تەمێکی تر،

بە نێو گوللەکانی سەرکەوتن دەبەزین و بە دیار تەرمەکانەوە

دەیانقڕوسکاند.

ئەوەتا، خاکێکی هەناسەسوار و خێڵێکی هەڵتڕوشکاو،

هەوایەکی ئیفلیجیش لە جەستەماندا تەشەنە دەکا.

ئا ئەمەش نەوەیەکی زیندوو میوانی شارێکە،

سەربازەکانیشی لە مێژوویەک کفن سواڵ دەکەن و بە

گۆڕەکانیانەوە بەرەو دیلێتی ڕێدەکەن.

ئەلف و بای نەفرەتی ئاگریش لە ئاگردانی ماڵەکانمانەوە دەڕسکێ.

ئێمەین، ئەو تابووتە هەڵواسراوانەی ئاسمان، (1)

پێغەمبەرەکانیش دوا نوێژ بۆ ئەو بوونە کاڵەمان دەکان.

منیش دەچمەوە سەر درەختێکی ئاوسی نەزۆک و تیرەیەکی دێرینی

کەڤر. رووتییەکەشم بەدترە لە تێنوویەتی هاروت و ماروت.(2)

من باڵدارێکی پیرۆی بێناوم و لە کۆچڕەوێک، بە دوای کۆتاییەک،

پێشبینی سووڕگوومییەکم دەکرد.

دەمزانی مەرگ بوێرانەتر، لە من و زایەندە بە پیرۆزکراوە

جوانەمەرگەکەم، قوفڵەکان بەسەر پەشیمانبوونەوەی

چارەنووسماندا، دادەخات.

2

من وێنەی ئە، ئاوەم بەرەو کەندەکانی ئەمدیو تۆڕەکانی شەو

هەنگاو دەنێم.

ناوەکان لەوێ دابەشدەکرێن.

ژنەکانیش لەوێ بە دڵە گۆزەییە سەوزەکانی سەر شانیان و بە

تیشکە تکاوەکانی چاوە گەواڵەنیشینییەکانیانەوە، بە رووەمدا

دەتریقێنەوە.

ئیتر من ناتوانم لە شەقامەکانی ئەم تاراوگە دوونەییەدا، بەبێ ئەو

بیرەوەرییانە، لەگەڵ ژیان زاوزێ بکەم.

بە من چی، گەشتی ئەو سەرهاتە دەمارگیرانە!

چی لە من دەوێ، ئەم ناسیاوەی کە شەوانە بۆ دواجار،

نامەیەکی ماڵئاوایی لەسەر سەرینەکەم، وەک نووشتەیەک

بەجێدەهێڵێت و

جارێکی تریش، وەک بەیادهاتنەوەیەکی راچڵەکاو، بە

زەمبیلەیەکی پڕ لە گوڵئەستێرەی خەواڵوو و جووتە کەروێشکێکی

سپی ساواوە، دەگەڕێتەوە؟!

لە هەموو هانا هێنانێک، من هەست بە دەستێکی سارد دەکەم.

3

لە پێشوازی هاواری شارێکدا، هێوری هەورێکم پۆشیووە،

کە تەنیایەک لە رۆناکییەکانی دەڕژێ و

رازەکانیشی تەمەننایەکە لە چاوەکانمدا بەردەگرن.

رەگاکانی لە مندا ریشاژۆیە.

بە خۆشم میوانی منێکم:

بە کەشکۆڵێکی وجود و

بە دەفتەرێکی هەرەس و

بە ئەلبومێکی گومانەوە،

لە باغچەی عەدەمدا وانەی زمان لەگەڵ مەزهەبەکان دەخوێنم.

بەدەم باسی فەلسەفەوە، منداڵێک لە ناخمدا، لە زەردەپەڕێکی

مانگی پووشپەڕدا،

بەرەو قوتابخانە؛

تلدەخوا؛

تلدەبێتەوە،

بە قامکەکانی باران،

سافیرە، فیت فیتە، بە وشەکانم لێدەدا.

4

لە شارێکی چۆڵنیشیندا،

دەستێک تەوقە لەگەڵ نادیارییەک دەکا.

ئاخۆ ئەمە ماڵئاوایی ئەو رێبوارە بەخشندە بێ؟

تەنیاییەک دەبینم، لە رۆژانی پشوودا،

ئێواران بەدەم گۆرانییەوە تا چاو بڕکات گێلاس دەخوا و

جار ناجارێ وەک ماسیگرێک زەمان راودەکا،

هەندێ جاریش بە زایاڵەی یادەکانییەوە،

جوگرافیایەکی لە خەوداماو:

ئاوەدان دەبێتەوە،

ئاوەدان...

دەنگێک بە پێیەکانی ئاسمان سەفەر دەکا و

لێرە تەنیا هەنارێک و هێشووە گێلاسێک بۆ منی دوورگە

بەجێدەهێلێ.

شێتەکانیش لە بێدەنگیدابێدار دەبنەوە و

ستوونە بە چراخانە رایەڵکراوەکانی ئاسۆ،

یەک بە یەک بە تێڕامانەکانیانەوە خامۆشدەکەن.

شەوێک بە هانکە هانک دێتە پێش و پێڵوەکانی زەوی دادەپۆشێ.

دەنگەکان دەلەرنەوە،

دەنگەکان دێنە گۆ:

بینایی‌مان کەنەفتبوو،

لە تەماشاکردنی ئەو فرشتە قوڕقوشمیانەی

کە بە ستوونەکانەوە دێنە خوار.

بیستنمان وێژەنگدەدا،

لە سڵاوە ستەمگەرەکانی ئەو باوکانەی جەنگەڵی مێژوو.

دڵمان کول بوو،

لە سێبووری ئەو شووشە لە سیحر پڕکراوانەی

کە بەختی دۆستایەتیەکمان بۆ هەڵناهێنن.

ڕۆناکییەکان لە شکۆفەگرتنی تیشکەکانیانەوە،

جادووکەرانە لەگەڵ سنەوبەرەکانی خەیاڵ، سەما دەکەن.

موژدە دڵگیرەکانی حەقیقەت دەمامکەکانی،

ئەو پەنجەرانەی کە بەسەر هەناسەی سەدەکانەوە داخراون،

دەستخەڕۆ دەدەن.

پیریەتییەکان بە خۆشییەک لاوترین سەوسەن لە تەمەنیان

دەچننەوە و لە بانیۆی ژنێتی مۆمیای دەکەن و

لە ئاوێنەی خەوێکدا یەکتر رادەمووسن.

5

خەونێک بە مەحاڵ بینینەوە، گەمارۆدانی سەفەرێکی تر

رادەگەیەنێ.

تاوانبارێک بەر لە من پەناگەیەک، لە خوایەکان وەردەگرێ.

مەشیشەکێشێک لە نیوە شەوێکدا، بە ژێر رێگای کاکێشان،

بە دوای مانگی رەنجاودا رادەکا و

لە وێستێکدا پەشۆکاو بۆ کورسییە وەفادارەکان ئەزموونەکانی

دەخوێنێتەوە:

دەبێ بە هزرکردنەوە لەبەردەم شەبەنگەکانی ناو تەنیایی

بچەمێینەوە.

دەبێ لە پیتەکانی بەراپڕا،

جەغت لە دەستپێکردنەوەیەک بکەین.

دەبێ لە سپێدەدا،

پەرداخێک مانا لە پەرێشانییەکان، هەڵبدەین.

دەبێ ئومێدەوارانە لە بۆشاییەکان،

خۆشەویستییەک بە هەست بناسین.

دەبێ بە خۆمان گورزە تەئویلێک،

لە دەستی نەبینراویدا، بڕفێنین.

6

ئەو هەنگاوە وێڵەی لە دەماری گەرووپەک دەفراژێ،

تەنیا دەنێک نیە.

دەشێ لە دایکبوونی دەرککردنێک بێ،

یان ژانێ بێ و لە خۆی بپەیڤێ؟

ئەوکاتەش بە ئاماژەیەک کۆتایی دێنین بە گەڕان،

بڕوای راوەستەکان، هەتیوانە لەبەرمان دەپاڕێنەوە.

لەوێش:

کیژەکان لەبەر هەیوان دەستماڵەکانیان

_ بۆ ئەو کوڕانەی لە شەڕ نەگەڕانەوە _ هەڵدەدەن و

ترسی کچێنی لە مەمکە حەسوودەکانیان دەڕەوێتەوە:

(بریا پیاوەکانی ئێمە دوایان بڕابایە).

7

خودایەکی خۆڵەمێشی

لەسەر دەستێکی چێنراودا،

بە دوعایەکانی سەفەری دایکم بۆ بەهەشت دوودڵدەکا.

ئەو تاکە کوندەپەپووە حوزنبار و

ئەو هەموو باڵندە سوورگوومانەی سەر پەیژەکانی شار،

کە بەدەست پاسەوانی زمانی لاڵمەوە هەڵاتوونە هەڵفڕین،

ڕۆژ نیە لە چاوەڕوانی کەسێکدا،

چاوەڕوانەکان بە کتێبی ئەو کۆچە سەر گەرم نەکەن.

درەنگانێ لەناو _ با _ یەکی ژاکاودا،

پەیڤە بەجێماوەککان لەسەر کازیوە گلدەدەنەوە.

پاییزیش بە بووتڵە بەتاڵەکانیەوە،

بەناو چاوە زەردەکانی ڕۆح دەسووڕێتەوە.

8

ئەو وەرزانە چەند بێباکن، بەرانبەر پەیمانەکانی من.

ئەو ساڵانە چەند بارگرانن، بە خەونە رەشنووسەکانی من.

منێکی ئاشناش، لە خۆی نائاشنا دەبێ.

نائاگایەکیش لە کۆچەکەیدا، وەک شیعرەکانی لۆتریامۆن،

لە دەروازەکانی ئەبەدیدا، بەدەم نۆشی ئێشەکان،

بەسەر شەپۆڵە شوومپڕژێنەکانی شوێن،

هەدادان دەبوورێتەوە.

شەوێ لە ناخدا رادەسێ و

چەقۆیەکی نووشتاوە لە زمانی ئاگرڕا،

لە ئاگردانێکی نادیار، خۆی هەڵدەکێشێ.

رۆژێکی کەڕ لە زەوی خۆی مشتوماڵ دەکا و

بە پرسیارێکی جمکانە، لە وەرامێکی بینراو هەڵدەچێ.

منیش کەسێکم،

نە لە ئەفسانە ناولێنراوەکانی ئەوێ و

نە لە کۆدی داستانە پۆلێنکراوەکانی ئێرەش،

بە

ئ

ا

و

ێ

ن

ە

ی

ە

ک

دەبمەوە.

1997

ستۆکهۆلم

(1) ئەم دێرەم لە نامەی هاوڕێیەک وەرگرتووە.

(2) هاروت و ماروت: دوو فریشتە بوون، خەڵکیان فێری جادووگەری دەکرد. خواش غەزەبی لێگرتوون لە بیرێکدا سەرەوخوار هەڵیواسیوون. ناویشیان لە قورئان هاتووە.

## سێپتێمبەر

بە جانتایەکی پڕ لە نامە و دەستنووسێکی دەستتەوە؛

ئەم کاتە هێڵ بەژێر کێشراوانە لە یاد مەکە،

بەناو ئەم سپێدەیەدا رێدەکەی!

بایەکەش دەمنادەمێ، وەک بەیادهاتنەوەکانت

رووخسارت گرژ دەکا.

دەستەکانت دوگمەکانی چاکەتەکەت دادەخەن.

بەناو هەوای تەڕ و بۆنی سپینداره مەیلە و کاڵەکاندا دەڕۆی.

گێژەنی گەڵا وەریوەکان روومەتی سپێدەکە ختۆکە دەدەن.

کۆترەکان بەسەر کورسی گۆڕەپانەکەدا،

بەچاوە خەواڵووەکانیانەوە، دەڕواننە رووی هەتاوە شەرمنەکە.

مانگی رەنگ هەنگوینیش، وەک هاوسەفەرێکی نەناس بەسەر
سەرتەوە
لەناو دەریاچەی هەوری ئاسماندا سەوڵ لێدەدا.
دوا رۆشنایی گلۆپەکانی شەقام لە باوەشی درەختەکاندا،
بەدەم چرپەوە خەو دەیانباتەوە.
پۆلە منداڵێک _ گوێ بە مامۆستا تازەکانیان نادەن _، شەقامە
خۆڵەمێشییەکە
رەنگاوڕەنگ دەکەن و ماشێنەکان بە هانکە هانک
بەرەو ژوور شار، هێور دەبنەوە.
تۆش رووت بەرەو زایاڵەی هەنگاوەکانی کات
وەردەگێڕی.
بە جانتایەکی پڕ لە پەیڤە بۆنگرەکانی یاد،
بە نێو ستوونەکانی باراندا بەرەو ماڵ دەبییەوە.
پشیلەیەک لەبەردەم خانووە بەرزەکاندا

ئەستێرەیەکی سەرگەردان

لەناو گۆمە ئاوێکدا راو دەکات.

پیرێژنە جیرانەکەشم نیگایە پیرەکەی

بەرەو ئاسمان هەڵدەبڕێ:

ئیتر ئەو پەنجەرانە دەبێ بەسەر سەرمادا دابخەم.

دەبێ ئەو گوڵەژاڵانە لە باڵکۆنەوە بێنمەوە ژوور.

ئەرێ تۆ کوارگت نەچنیتەوە؟

ئەو زەردەواڵانەش سەرمەستانە

بەدوای ژیاندا گاگۆڵکێ دەکەن.

تۆ لەمدیوی پەنجەرەکەتدا راوەستاوی و

لە دەرەوەش زەوی هێدی هێدی کراسە کەسکەکەی لەبەر

خۆیدا دادەکەنێ.

کورسییەکانیش،

بەرەو ژوور دێنەوە و

## نیگای دەست ................................

تەنیایش لە باڵکۆنەکەدا

جگەرە دەکێشێ.

پایزی 1999

ستۆکهۆلم

## باڵەفڕەی پەیڤەکان بەدەم ڕووتبونەوەی هەنارەوە

بۆ: شەبەنگەکانی Eleonora

1

لە دەنگ و

لە چاو و

لە شوێنکاتدا،

سێبەری ڕۆشنایی هەقیقەتە،

هەنگاوی بوونەکەت.

2

هەبوونیش بە پەیڤ

ئاگرێک نمایش دەکا.

گوتنەکان لەسەر خوانی هزر،

هۆگریەک لە پرسیار بە ژیان و کاتاکان دەبەخشن.

3

بەدەم بیرکردنەوە خودڕسکیەکانەوە،

وەک مێرووڵە باڵدارەکان،

بووین بە خودێک لە باڵەکان.

هەڵفڕین لە ماڵەکانمانەوە.

لە شوێنە نەناسراوەکان،

ئازار فەرامۆشی کردین و

بێناو، بە ئاواز،

بە قبووڵکردنێکی ئاماژە ئاسا،

بوونشین بووین لە زمانی بێگانەکان.

پەیڤەکانیش لە ئاسمانی خەیاڵدا شەکەت بوون و

بە ڕۆشناییەک لە ئێستاماندا نەپەیڤین.

زمانمان بوونێکە لە ناڵە بێدەنگەکان.

فڕینی دەنگەکان، زرینگانەوەی مەرگە،

لێرە، لە مەڵە نائاشناکان.

4

باڵێک لە ڕۆح و

جەستەشم ڕۆناکی هەنار.

من چیتر بە ڕاڤەی سەرهاتی هەبوونێک سەرقاڵ نیم

ماڵەکەم دەنگێکە،

لە سروودی باڵندە و زایاڵەی ئەزموونێک.

5

وڵاتیش هەندێ جار بە نیگای ملوانکەی هەناری ژوورەکەم،

دەبێتە شەبەنگی ئێستایەک لە عەدەم.

لە رامان نیشتەجێ بووم و

هاوکاتیش تاراوگە شوێنێکە،

بە فڕین تێمدەگا.

وێدەچێ دەبێ خوداوەندێک لە هەنار بۆ خود تاقیبکەمەوە.

6

پەیژەکان هی گەڕانەوەن،

پەیژەکان هی سەرەتان.

لەوێیە دەرکەوتنی روخسارەکان،

لەوێیە شپرزەیی بەرەو ونبوونی ماهییەت.

لەسەر پلیکانەکانەوە سرتە سرتی بیر کردنەوە و

وروژانی بوون لە سەرقاڵی مانەوە.

تۆش لە هەڵگەڕانەوەیەکدا، تایبەتییەک جەختدەکەیتەوە.

7

چۆن نێوان ڕەگەکان دەبڕی؟

چەند هەستت بە لەشی ئێسکەکان کرد؟

خەیاڵم بە چرپە،

کێوەکانی دەروون و

شەپۆلی زایاڵەی ئاگاییم، دەدوێنێ.

لە هیکڕا دەبم بە ئێستایەک لە شەبەنگ.

وەک خۆم بم،

سێبەری مەحالی بەناو ڕاڕایی جەستەمدا ڕۆدەچێ:

دەبمەوە  ئاپۆرەی یادوەریی شاخەکان.

لێرەوە ئیرادە بوونی من بۆ ڕاسان گاز داکا.

8

پەیڤەکانیش خۆیان جەختدەکەنەوە،

بەناو کراوەکانیش فرەوانتر، یان کاڵتر دەبن.

شتەکان، وەک دەنگی بزوانەکان لێک ناچن.

وێدەچێ جیاوازییەکان بە خەمڵێن ئاوێزان بن؟

جیابوونەوە دەربڕینی وێنەیە و

بێدنگ بوونمان نەمانی وشەیە.

وشەکانیشمان بێ وێنەن.

9

کە بەدەم بیستنەوە دەپەیڤی

بە تەنیا هەست بە مەرگ دەکەی.

ڕەنگە ژیانێک،

لەگەڵ سەرەتایەکی خەمۆکدا دەرکەوێ.

دونیا بەم گوێگرتنە سەرهەڵدەگرێ و

پەیامێک رادەگەیەنێ.

لە ئێستایەکی روفۆکدا،

وەک بزوانە لێکترازاوەکان گۆرانی دەچڕی،

تا ژیان پێی بژی و تا بوونت تیای بژی.

ئەوەتا لە زاردا،

گەڕانێک سەرهەڵدەگرێ.

10

دەچینەوە ناو جەنگی دەنگدانەوەکان،

دەگەڕێینەوە لە لاشەڕی بێدەنگی.

وەک مرۆڤە سادەکان و

ڕەنگ و رووی دەمکاتەکان،

لە بری هەوری مانایە تازەکان:

پەڵەیەکین ئامادەبوونمان بۆ قبووڵکردن بەرجەستە دەکەینەوە.

11

لە وێڵیەکانەوە دەنگێک دێتە پێشەوە.

وەک سروود و وڕێنەی خەونەکان،

دەبین بە کۆستی داستانە نادیارەکانی کوردبوونی –با.

چرای ڕوخسارمان دادەگیرسێن و

پێشبینییەکانش مێژوو دادەپۆشن

دوودڵم لە گەشتی ئەم دەنگە.

ئەمە ویستێکە فەرامۆشی خۆی دەلاوێنێتەوە.

دەمەوێ بچمە بەر بارانێک:

بوونێک بەڕێوە خۆی نمایشدەکا،

12

تاراوگە هەندێ جار،

دەنگێکە بە خاوی لە ناخدا دەفراژێ.

خۆت بچڕە...

سێبەرم لە شلەژان،

رووباری جەستە و رووگەتە،

پێدەگرێ.

خۆرئاواش لە پرسیاری دواندنمان فێدەگرێ.

13

لە دۆستایەتی نیگەرانیەک مەترازێ و

دەنگی خۆت جەخت کە.

برادەرە دوورەکان هەورێکن،

لە پیاسەی ئێستایەک.

کەواتە:

دواندنی ئەلکترۆن روانگەیەکە،

لە بوونی سۆراخمان؛

ئێمە بە فەرامۆشی یادوەری سەرقاڵین.

14

وەک رووتی بەیاک،

حەزێک دەچڕی،

دەنگی تۆ.

وەک بۆنی پڕژاوی شەرمنی هەنارێک،

داتدەپۆشێ و داگیرتدەکا: ژنێتی

جەستەیەک لە پرشنگ و لەشێک لە کانییەکان،

باناو رەنگەکاندا رادەبێ و رۆدەچێ

رژانێک لە هەڵمی بوونەوەیەکدا،

شکۆفەیەک لە ئەرخەوانی لە نێوان رانەکاندا،

رەنگڕێژت دەکا.

باڵندە جووتبووەکان لەسەر گوڵی مەمکانتا هەڵفڕین.

لەمدیو ئاوەڵکراسەکەی کازیوە،

جەستەیەکین لە تیرێژەکانی چێژ.

ژنێتیش: فارمۆشکردنی تاراوگەیە.

15

لە هیکڕا درەختی هەنارێک لە مەزەندەم دەڕسکێ و

گوڵناریش هێورانە:

هەوەسی روانینە.

کیژەکان لە ئامێز چیای (هەورێ)

لە هاوینێکی رەزەکانی (نازەنین)،

زریانی یادوەریم رام دەکەن.

16

ئەوەتا نەورەسێک لەسەر یاد و

شەپۆلی ئێوارەی لەشە رووتەکان،

لەنگەر دەگرێ و دەنیشێتەوە و

بە ئاوازێک،

گەشتەکەی بۆ عەدەم دەگۆڕێت.

17

روانینی سەفەرت هەڵگرتووە.

ئاماژەیت و ئاسۆت پۆشیووە.

لە زارتدایە باڵەکان.

لە رۆحت دەچن پیتەکان،

تیشکی رۆح لە پەنجەکانتەوە

شوێنەکەت رووتدەکاتەوە، ئاوەڵا دەکاتەوە.

پرسیارت، خەمی خود،

جێدێڵن.

18

کاتەکان لێکئاڵاو،

سوورِ دەخۆن لە چاوم، بە ئاوێنەم دەکەنەوە.

لە گەڕانەوەیەکدا، لە پێداهەڵچوونەوەیەکدا: شەپۆڵبدا.

پەرێشانییەک لەژێر پێڵوەکانی بیرکردنەوە دەجمێ،

لەم ماڵە.

19

چنگی کات لە ناخ و

لە دەنگ و لە هەنگاوەکانی گەڕانەوە،

لە گۆڕانەکانی ڕوانینما ئاڵاوە.

وێدەچێ مەحاڵییەت: ڕوانگەکەت،

سێبەری قەدەری شەیتان بێ.

20

ئێوارەی باران و بارانی شار و

وەسوەسەی ئاپۆڕەی ترافیک،

کۆچی یادەوەریش،

لە زاڵەیەکدا گوومڕات دەکا.

بەدەم چڕبوونەوەیەکەوە،

بە تەمای تەقینەوەیەک،

پەلکەزێڕینەیەک: شوێنکاتی عەدەمت، ڕۆشندەکاتەوە.

ها ئەوە، لە مەکری سەگەکەی،

مناڵێک پێدەکەنێ.

لە ژێر ئەو مانگی چۆڵستانەدا،

هەنیەی تاراوگەیە شەوقدەداتەوە.

21

لە چاوەڕوانییەکی پەنگخواردوودا،

لە راسانێکی تاکدا، لە هەرەسێکێ کۆدا،

بۆ سەرکێشییەک:

جوداخوازییەک، نەگووتنێک، دەپەیڤێ.

لە بەردەوامییەکدا، بۆ سەرگێژیەکی ژیاندان،

لە پۆلێنکردنی زاردا،

دەست بەسەر داگرتنی سەرکەوتنە،

ئاوەڵایی من.

22

جوڵەی بوون، دوو رەنگی رەگەزی،

مەیلی جووتبیبونش،

قەت نابێ بەر لە خواژن بووبێ.

بەرێوە سەرهەڵدەگرێ،

ژیانی مە.

با کەمێک بە چاوەڕوانیدا تێهەڵچینەوە:

ئاسۆیەک دێتە پێشەوە.

ئەم رۆژەش لەم وەرزەدا،

سەرگێژترە لە پەرێشانی من.

23

زایەڵەی توناوتوونێکە،

خەونی من.

لە هەنووکەیەکی داڕماودا،

سەرهاتە لێکترازاوەکانت بچڕە.

بە ویستێک، لە هەڵگەڕانەوەیەکدا،

لە زماندا، لە بەسەچوونەوەیەکدا،

لە سەهەندەیی و سەرهەڵگرتندا،

کایە ئەفراندن و جێهێشتنی ئاسەوارێکە؛ دابڕانێکە،

فەرامۆشکردن.

24

منداڵێک لە جیاتی گوڵئەستێرەیەک،

شەوبۆیەک بۆ هەتاو درێژ دەکا.

بەناو بارانی یادوەری هاتی،

تۆ ئەی بەرەبەیانی پیریەتی.

بەهەمەحاڵ،

بە مەحاڵییەک لە ڕۆشنایی،

لە گەڕانێک بەناو فەناتدا،

تاراوگەش:

تێگەیشتن و گۆڕانێکە لە گومان.

25

ڕێگایەکان سێبەری مانگ دەپۆشن،

کۆچەکەت بەناو شەو ڕێدەکا.

شاخەکان ملکەچ و پێدەشتیش هەڵکوڕماو دەسووتان.

ئابلۆقەت خوێندەوە و

تفەنگە هاوڕێکەت.

خەونەکان:

لە ڕاڕەوەکانی ئایندە سەرابن.

26

بە رامان، لە دەنگ و جەنگەکان،

زیاڵەی کێوەکان دەجمێن.

ئەوەتا بە ویستی نامۆیی باڵدەگرم،

بۆشاییم تەنییەوە.

بە پێتی ئەزموونێک لە خوڕە،

تاراوگەی نەبینراو،

لە چاوی ئاسۆییەک دەنووسیتەوە.

27

کۆچ بە ئاماژە شەبەنگییەکانی،

ڕێچکەیەک لە بناری کارۆخ و

تیرێژێک لە داستانی "قەوزەی ناو کانییەکەی مەلەکان"

لە ماڵی یادەوەری دەڕوانێ و دەنوێنێ.

لێرەڕا، رۆشناییەک لە روانگە و

هزرێکی تێنووش، لە جەستەمەوە هانکە هانک رادەپسکێ.

بۆ زەردەواڵەکان دەروازەکەت والا بکە،

ئەی ئایندە!

28

بە نهێنی شەو کۆچ و

ئەستێرەی راماوی سەر لووتکە،

شەوبایەک لەوێوە بۆنی چیا هەڵدەگرێ و

تەنیایی ئێوارەی یەک شەممە و بۆشایی باغچەکەم

ئاوڕشیندەکا.

ئاوڕێک بۆ دەستنووسی سەر هەنییەک دەڕوانێ:

ژیاننامەیەک لە باڵی بێماڵی،

تاراوگەش تاقیکردنەوەیەک لە نادیار.

29

لە ئاوەڵا بوون و لە هەنگاو و

لە گەڕانەوە و لە دۆشداماندا،

کردەی هەڵکاڵینێکە؛

دەنگدانەوەی وشە.

30

بەدەم گەڕیدەی بۆشایی،

بە نێو چۆڕانەوەی چۆلایی،

لەبەر چاوان و بەدەست ئاوابوونی ئاگایی،

بە جێنشین بوون سێبەرێک،

سێبەرێک شەق دەکەی.

لە جێگۆڕکێی کات و لە شوێنە کاڵبۆوەکاندا،

باڵفڕە و ڕەو کردنێکە؛

سوورگەی باڵە سرتە هەڵگرتووەکانی،

شەبەنگی زمانی من.

31

لە بزواندا سەرچاوە گۆڕانتە.

شوێن لە ئاماژەی یەکاتییەک دەخەمڵێ،

یان ئامادەبوونی ئاراستەی ئاسۆیەک؟

جمانی پرسیارێک؛ زایاڵەی چڕبوونەوەیەک،

رامانت دەفڕێنێ.

هێڵی کۆچ، تەمتەمەی هزرەکان،

ئاسۆکەت دەبێژێ.

بە چاوەکان نقوومتدەکا جیاوازی،

دەتەنێتەوە پەرگیریی.

کەواتە: لە بیرکردنەوەی دابڕانێکدا،

بەدەست ئاوارە بوونێک و لە ڕۆچوونی تێهەڵچوونەوەیەکدا،

ڕۆشنتدەکاتەوە زمانی بزوانت.

ئەوکاتەی بەدەم پەیڤینی کۆچڕەوا،

وەک نەبوون، لە ئاوێنەبوونەوەیەکدا:

دەلەریتەوە.

32

لە گەڕاندایە مانایەک؛

لە مانا و لە یادتدایە کۆچەکەت.

باڵێک لە رابردوو و

ڕۆچوونێک لە دڵی داهاتوو:

جووتە باڵێکە هەبوونی پەیڤی من، ئاسۆکەم.

33

ئازارێک لە چریکەی جەستەوە

نمایشێک لە یادی شەڕەکان،

لێرەوە بۆ ئەوێ،

لە خەودا رادەبی:

نە لێرە و نە لەوێی.

لە نێوان دوو ماوە؛ دوو وڵاتی نامۆدا،

خەونێکە پەرت دەجمێ، دەپەیڤێ:

ئەم منە!

34

راسانێک، کۆڕەوێک، لە دەنگی خێڵێکدا ئاوارە دەبێ و

چڕنوکێک لە ناوەکیدا بیرهاتنەوەکان دەئەنجنێ.

مانایەک لە زاردا هەڵدەگەڕێتەوە و

نەوەیەک لە زماندا غەوارە دەبێ،

شوێن پێیەک لە شۆڕش، لە یەکاتییەکی رماودا ،

هەڕاجی رادەگەیەنێ.

مێژوویەک بەدەست دێوجامەی سەروەری بێسەردا،

ئیرادەی زڕاوە.

35

لەمدیو تەنورەی سورتەوە،

سەمای ختۆکە و شەبەنگی هەوەسە،

شەپۆڵی مەمکی تۆ.

دەنگیشت جۆلانەی بارانە و

لە خاوی بوون دەچێ،

خورپەی شیلەی تۆ.

بە ژنێتیت تەڕ بوونی دەنوێنێ،

ئێوارە.

کێشوەری مەیل دەچڕێ،

ئاهەنگی باڵندەی ڕژانت.

جەستەیەک لە یەکەی لەشێکدا  دەپشکوێ و

بە دەم ئاوازی راماندا،

دوو رووبار نقوومی یەک دەبن.

لە چاو، لە دەم و و بۆنی رۆحەوە،

هاڵاوی توانەوەین،

ئاوازێک دەلاوێنینەوە. بارانێک دەنووسینیەوە.

36

بەسەر شەپۆڵی شوێنەوە،

لە جەنگی کەڵکەڵەی کاتێکی بێخاڵدا.

بە بینیایەک لە فەرامۆشی زەریا،

جەستەی بە خەون گەمارۆدراوم

رووتدەکاتەوە:

ئەم کیژە.

37

تەقینەوەیەک لە گومان

فرینێک بە باڵەکانی بێدەنگی،

هێورانە زمانم پڕدەکا لە جوڵە.

شەبەنگێک لە بزەی هەقیقەتە،

ئەم خودە.

38

تاراوگەش تۆڕێکە لە سرتەی دیاردەی من دەفراژێ،

تەکانێک لە قوڕگی عەدەمدا روانگەکەت تەیدەکا.

وەک جەنگێک پانتایی هەقیقەت دادەگری،

پەرتەوازەیەک لە رووخسارتدا دەتکێ و

لە هەڵکاڵینەوەتدا دابڕانێک لە ماک رادەگەیەنی.

لە پیت و لە سەرروای گوتندا تێهەڵدەچیتەوە؛ دەلەرێتەوە.

سووڕگوومی خەونێکە،

ئەم گێڕانەوەی من.

39

لە نێوان سێبەر و شەقی هەناردا،

بە دەم لەرزەوە شەبەنگی دەنوێنی.

پاییزیش لەمدیوی ئاگایی گەڵاوە دەرژێتە ناوجەستەت.

لە خاو بوونەوەدا خەو دەیگرێ،

دەنگی تۆ.

لە ناو جۆلانەی گەرمیدا،

خپ دەبێ مەمکی تۆ.

دەنووشتێمەوە،

دەگەشێتەوە، گنگڵدەدا نازی بۆن.

بە شلبوونەوەیەک لە دوای تامی هەنار

گوڵدانێک شیلەی لێدەرژێ،

شکۆفەیەک لە ئاوی مۆردا خپدەبێ،

هەنسێک بۆنی لێدەشنێ و

گوڵەناریش بە چرپە رازی لێدەچۆڕێ.

سەر زەوی بە لەرزەی دەنگەوە لێوان لێو دەبێ،

سەر لەنوێ بە خۆمان دەگرێت؛

عەدەمێک.

40

ئاراستەی جیاوازی وشەکان دەبینی؟

خواستنێک لە یەکایەتی گووتنگەل،

لە ناوەکیترا دەتخوازێت.

بە ئاوێنە نابێتەوە/ناکاتەوە،

زمانی دەرکیەت.

بیرڕۆیی تاودەدا و

مەلەیەک لە فەرامۆشی رووگەی گەڕانتە.

کۆتاییەکی نیە؛

ئاپۆرەی بێدەنگییەکەت.

41

لە دیمانەیەک نەکرا بڵێم:

هەروا پەیوەندی وشەکان لە گەمەی شوێن پێیە و

خێڵی دەق لای ئێمە بێ کایەن ،،،، هەروا....

بمخابن...، بیموورە، ئەی سەرۆک!

نابیسترێی؛ نابینرێی،

ئەی دەڤەری جڵەوکراو؛ دەمبەستکراو!

ئاخر چۆن رامانێک هەنگاومان پێبەخشێ؟

لە ژاندا، لە شەهوەتدا، لە شاگەشکە بووندا،

بیرهاتنەوەیەکین لە قەدەردا:

دەلەرینەوە؛ لە یاددا دەچینەوە.

42

شتەکان بە دوای ناو ورووژان،

نیگای دەست ..............................

مەیلاندن لە باڵەکاندا بە نەوا ئاوەڵا دەبنەوە.

ژوورەکەم پڕ بووە لە ترپەی "گفتوگۆ"ی مەحویەکی گەڕیدە و

پرسیاری خەڵوەتی دایگرتووم.

تاراوگەش لەبەر "جەست و جۆی" مانگەشەو،

بۆ چۆڵەکانی بەربەیان،

وەسوەسەیماڵەوە دەگێڕێتەوە...

بەهار ی 2005– 2004

ستۆکهۆلم– سوێد

## خۆڵەمێشی خەون

1

بارانی دێسێمبەر، وەک دەستنووسەکان،
بەدەم بای "کەناڵی ئینگلیز"ەوە،
بینایی خەونەکەت پەرتدەکا و گۆڕی شوێنەکەت بۆنڕێژ دەکا.
پەنجەرەکەت بەسەر دەنگدانەوەی ژوورەکەتدا واڵادەبێ.
مانگ بەر لە ماڵئاوایی بە پەنجە هەنگوینییەکەی نێوچەوانی
بۆشایی کات خاودەکاتەوە.
جاڵجاڵۆکەی قەد دیوارەکەش،
لەبەر تیشکەکانی ناو هەناسەکانی باراندا،
بە شەبەنگەکانی خەونەکەت، ماڵێک بۆ گومڕایی بوونەکەت
دەهۆنێتەوە.

ژوورەکەت پڕ دەبێ لە پیت و

شەوەکەش بە ژنێتییە پیرەکەی لەگەڵ ئاسۆدا جووتدەبێ.

بەدەم هەنگاوەکانی خەنەوە،

شوێنەکە لە ناختا دەئاڵێ و بە رامانێک ئاوڕ لە دواوە دەدەیتەوە:

کات لە جەستەدا هەناسە دەکێشێ.

2

پێکەنینێکی مەست و

ئومێدێک لە چاوەکانی بۆشایی،

یادرەریت بێدار دەکاتەوە.

گۆڕێکیش لە چاوەڕوانییە هیچگەراییەکەیدا،

بەدەم بەیادهاتنەوەکانتدا، وەک ئاوێزانی ئاو بە یەکایەتییەکەی،

لە خود یەکتدەخات،

لە جوگرافیای خەونەکەدا، بەدوای کێڵەکەیدا دەگەڕێ.

تۆش بە جەستەی ژانتەوە،

لە دوورگەی نەبووندا جیادەبوویتەوە.

3

چرایەکان لەبەر باراندا، وەک ژنەکانی خەیاڵ،

بە تیشک زەوی گەرمدەکەنەوە.

لەوێ، لە شەممەیەکی هەوەسدار،

بەسەر قەوزەی رووباری "کانتربۆری"دا یەکتر رادەمووسن.

"، کە لە تابوتێکی ژیان دەچێ،High streetلە دووڕیانی "

سەگە خەوتوەکەی سەر رانی بێماڵێک

چاوە پڕ لە ئەزموونەکانی هەڵدێنێ و

لە بەیانییەکی یاد پرژاودا،

وادەزنێ ئەو خوێندکارە دوا خوردەکەی فڕێداوەتە ناو شەپقە

باوێشکگرتووەکەی بەردمیان.

هاوکاتیش کاتدرالەکە، بە زەنگەڵەکانی،

وەک بانگەکانی "ئاوگۆستینۆش"

دەنگی شەو دەدا

4

فەونەکە لە نیوەڕێدا بە کۆتاییە بەرهەڵدراوەکەیدا دەتسپێرێ.

پۆڵە باڵندەیەک،

وەک پیتە پەرش و بڵاوەکانی سەر زارتی یادوەری،

بەناو رۆناکی گزنگدا سوورٍ دەفۆن.

بەدەم پەنگدانەوەی دوو دڵیدا،

رووت وەرگێڕا:

بەسەر شانی شاخێکەوە،

گۆڕەکەت شەمەندەفەرێکە و

بەناو ئاسۆی ئاسمانێکی لێکرۆچوودا ئاوا دەبوو.

5

لێرەوە بە یادهاتنەوەکانت دەستپێدەکەن و

پەیڤەکان بێدەنگ دەبن.

بە خۆم خەونەوە دەچمە بەر پەنجەرەکە و

گوێ لە گۆرانی ئەم درەختە دەگرم.

"خەونەکەش لە نێوان لە دایکبوون و مەرگدا،

بوولێڵەکە دەبڕێ".*

لەوێش، لەمدیو ماڵەکان،

نیگای دەست ..............................

بەربەیان بەسەر شەودا چەماوەتەوە.

باڵندەلکانیش بەدەم سپێدەوە سرووودێک دەچڕن.

لە هیکرا "ئێلیۆنۆرە" پرچە پەرش و بڵاوەکەی هەڵدەداتەوە.

"بۆق چاوە سوورەکە"ی لە نێو دەستە خەواوییەکەی باز دەدا.

پەردەی پەنجەرەکە بەسەر زایاڵەی دەنگەکاندا ئاوەڵا دەکاتەوە:

ئەوە نامەبەر بوو،

لە هاوڕێیە دوورەکەیەوە

لەگەڵ نامەیەکدا شوکولاتی رەنگاڕەنگی بۆ هێناوە!

24ی دێسێمبەری 2001

کانتربۆری/بەرتانیا

* ئێلیۆت، چوارشەمەی خۆڵەمێشی/ Ash-Wednesday، 1930

## سەفەرەکانی هەناسە

لە هەمان ژووردا

ژیان کراسی خەندە لەبەر خۆی دادەکەنێ،

لێگەڕا دەستەکانم

بە سانایی بە دڵی ئەڵماسەکان بکەوێ،

لە دەوری دەستەکانمدا بازنۆکەیەکی کێشا.

لە دەرەوەی ژوورەکەمدا

لە بەرامبەر بێدەنگی بۆشاییدا

ژوورێکی ترە لە بێ سنووری.

لەم ژوورەدا

مراوییەکان بوون بە فەغفوورییەکی بەناڵ،

شێوەیەک بە درزی چارەنووسێکی بەدبین دەکێشین،

تەنیا هەوایان تێکشکاند،

لەوێ چیتر هەناسەدان نەمایەوە.



## نیگای دەست

ئەوە من بووم
هەروەک دوو جار هەناسەم کێشابێ،
قەڵایەک لە شپرزەیی هەوا،
بە بۆنی لە نەبوونی هیچ شتێ هەڵزنام،
وەک کاتی ژن گواستنەوە
گوڵە سیسەکانم خوارد.
هەموو رۆژێ تا شەو
لەوێ لە ناوەوە
خەونم بە شێرێک دەبینی
رۆژێک دێ تف لە پەپوولەکان دەکا،
لە ژوورەکەی دەرەوەشدا،
توانایی من.

2002–11–22

ستۆکهۆڵم

## لە خاکی خۆتدا بمڕوێنە

گوڵێکی زەردت لە قژ داوە
دەڵێی باخچەی ئیمپراتۆری ڕەنگەکان،
لەسەرتدا شین دەبن.
دەڵێی هەتاو لەگەڵ بیرە بێکۆتاییەکانت
پەیمانی ڕاگەیاندووە.
بەرەو پێش دەنووشتێمەوە،
هەتا چرپەی چاوە خەواڵووو ئارەزوو ڕێژەکانت
جوانتر ببیستم و
لە ناو ئەم شەوە بێدەنگەدا
نیگا دڵگیرەکانم، هێور بکەن.
لە پرچی تۆوە
بۆنی بریقەی ئاڵۆزکاوی زەریا دەکەم!
ئەم ئێوارەیە
ژوورەکەم و شەوی پەنهانم
بۆنڕێژ دەکەی.

## نیگای دەست ..............................

بەدەم ماچی گوڵەکانی سەر سەرینەوە،

دەمەوێ پەمۆی روومەتەکانت رام بکەم،

هەتا رۆشنایی یادەکەی دوێنێ دەسگیر بکەم.

لە کایەی خاکدا گوڵەکان دەفراژێن..

بەنێو بێدەنگی تاریکدا بانگت دەکەم،

هەتا سرووودی چۆلەکەکانی کازیوە

بمبەن بۆ ناو باخچەکە.

لەوێدا دەمەوێ لە ناو پەڕەکانی تاوس و

گوڵە ناسکەکانی درەختەکاندا وێڵ ببم.

لەوێدا رێگای چوونە دەرەوەی

دنیای ناخت هەرگیز بدۆزمەوە.

لە ناو سەمای تاریکیدا

بەم گوڵە زەردەوە

باخچەکە بە جوانی دەبینم و

لە نێو چاوە هەڵاتووەکانتدا

هەستەکانم دەڕسکێن.

## نیگای دەست ..............................

لەژێر ئەم درەختە پیرەی باخچەدا

ئەم شەوە بۆ خەوتنە.

لێرەوە ئاسمانەوە هەتا گیایەکە دادەپۆشێ

درێژ دەبێتەوە.

منیش پەپوولە ئەستێرە ئاسایەکان دەگرم،

ئەم پەرێشانییەش

هەرگیز ئازاد نییە.

پاییزی 2001

ستۆکهۆڵم

## تریوەی مەرگ

شەوێک،
خۆی لە ناو شەپقەی چرایەکاندا حەشار دەدا،
هەتا رۆژی داهاتوو نەیخوات.
تیشکی گڵۆپەکان دەپۆشێ و
نادیاری ژیان رووتدەکاتەوە.
خۆی دەکاتە هاوشێوەی شەوەکان،
لەگەڵ رۆژەکان ئاوێتە دەبێ،
تا ئەودیوی کات دەڕوات و
بەسەر یادەکاندا دەگرێ،
کە تیکە تیکە دەیانفڕێنێ،
تاوەکو ژیان چیتر پەنایەکیان پێنەبەخشێ.

2002-11-14

ستۆکهۆڵم

## چارەنووسی کەمبینی

ئەو زارە قسەکەرانە پڕن لە ماسک و پەردەکان،

نیگاش لەو ڕێگایانە کوێر دەبێ،

کە هەموو دیوەکانی ئومێدیان دۆڕاند.

لەوێدا داستانە خۆ فێرکردووەکان

لەو شتانە دەپەیڤن کە هەرگیز بوونیان نەبوو.

فرمێسکەکان لە زمانی بێدەنگییەوە

لە زایەڵە پاڕانەوە،

کە لە ونبووندا ژیان دەخولقێنێ.

ئەو دەستانەی کە لە ئارەزوو چنراون

بە دوای کاتدا دەقیژێنن.

ئێمە دەمانتوانی گوێ بۆ خۆمان رادێرین و

تاریکی هەتاو بپشکنینەوە،

کوێر بووین بە جوانی تاریکی.

شانۆکان دڵۆپەی دوێنێیان لێ دەتکێ

## نیگای دەست ..............................



ژیانێک کە نەدەوترا تیاترۆ بێت.

دەنگێ بۆ یەکەم دیمەنی

راستییەکی گومڕا تێهەڵدەچێتەوە.

ئاه ئەی دونیا دڵڕفێن بنوێنە،

تۆ بە مەوداو

لە نیگای مندا

بە فیڕۆچووی.

2002–11–4

ستۆکهۆڵم

## پەنجەرەیەک

1

پەنجەرەیەک دەتوانێ هەموو شەو ئاوەڵابکاتەوە و
بەسەر ژیان و مەرگدا بڕیار بدات.
بێ ئەوەی دەرگایەکانی شەو دابخەی
بڕۆ بخەوە...

2

هەست چۆن دەنوێنێ؟
وەک خەونێک،
لە گوڵەبەڕۆژە، لە سێبەر.

ئەی ئەم خەونە؟
وەک هەڵکەوتێک لە رامانگەل.

## نیگای دەست

ئەی خۆوەرگێڕان؟

لێ هیچ نابینێ،
سەیر دەکرێ!

لە خەونێکی تردا
کە دەخەوێ و
گەردوون دەکا بە دەگمەنی خۆی.

2004.8
ستۆکهۆلم

## خەوی بەیانییەکی پێشتر

**بۆ کە من بیر لە تۆ دەکەمەوە کاغەزەکان بۆنی گوڵیان لێدێ؟**

بۆ: باوکم

چاوەکانم

خاڵین لە ڕۆناکی

تەنیا شەو هەڵدەمژن.

پێڵوە گرانەکان

ئومێدی بۆشایی دەخوازن،

لە کەمی ڕۆناکیدا

هێمنن.

تۆ و من بووین

## نیگای دەست ..............................

بەیانییەکانیش
وەک منداڵە شادەکان
بەرەو ئەو ژوورە پیاسەیان دەکرد
کە لەویدا ئومێدی خەوێکی بە کۆمەڵیان
بۆ ئێمە دەخواست.

ئەو بەیانییە وڕێنەییانە
تەنیا دەیانویست
لە پێناو ئاژاوەکانی
هەناسەی سەرفرازانبوونێک لە خەمەکان
بە ئێمە ببەخشێ.
من تا لەرزین وەڕەسی
ئەو چاوانە دەکەم
کە دەست لەناو دەست

## نیگای دەست ..............................

لەنێوان دوو نیگادا

توانی ڕۆحێک بکاتەوە.

2004.8.27

ستۆکهۆڵم

## هەتاو

دەڕۆم،
جوڵەکانی ئەو هەتاوە دەبڕم
کە لە دەوری چاوەکانمدا دادەنیشێ.

مێرگێکی زۆر،
بە دوو قاچەوە
خۆیان بۆ بینین بەرجەستە کردەوە؛
بەرهەمدار کرد،
بەرەو رووما بەڕێکەوتن
تا پێک بگەین.
مێرگەکانیان پەلی هاوێشت و
قاچەکانی منیش
وەک هێزێکی راکێشەر

## نیگای دەست ..............................

بەناو زەویدا رۆچوون.

بە رووی هەتاوی سووتێنەردا چەمامەوە و

هەستم کرد گژوگیا

نایەوێ گەشەبکا.

تێگەیشتم

چەووەکان لە چۆکم دەکێنم و

دەچم لە ئاسماندا پاڵدەکەوم.

بە دەستە راکشاوەکانمەوە

چۆلەکەیەک لە نێوان پەنجەکانمدا دەگرم.

2005.04

ستۆکهۆلم

**سترانی زەریا**

وابزانم لەبەر ئەوەبوو من ڕۆیشتم...

وەک هەتاوێک

ڕاست بەناو شەپۆڵەکاندا

لەناو زەریادا ئاوابووم.

خۆم لە ناوەوە بەتاڵ دەکەم

تاکوو ناخی خۆم دەپێکم.

لەوێدا من ڕاکشابووم

زەریایەکی ڕەش بەسەرمەوە بوو

کە دەکرا ئاسمان بێت.

لێرە تەزووی موگناتیس

ناگا بە من،

لەناو مندا،

تەنانەت چین لەسەر چینی زەریا و

ڕێچکەی چەوە تاڵەکان داپڕاون

لەو فرمێسکەی،

کە بەدوای بادا هاوار دەکا،

تاکوو بەناویدا سووڕ بخوا.

لەوێ لەمدیو ڕۆژەکاندا،

زانایەک دانیشتووە و

هەسدەکا ...

لەناو هەنگاوەکاندا وێڵبووە.

ئەو دەخوازێ بە چەو پریبکاتەوە،

لەناو خۆیدا نافی خۆی ڕەها بکا و

کۆتاییەکە

داپۆشێ.

2005.4

ستۆکهۆلم

ئیلیۆنۆرا برو: لە ساڵی 1979 لە شاری ستۆکهۆڵم لە دایکبووە، لە تەمەنی 17 ساڵیدا، لە پێشبڕکێی شیعری لە دەڤەری ڤارملاند کە دەکەوێتە رۆژئاوای سوێد، دووەم بووە، وێڕای شیعر، وتاری ئەدەبی سیاسی دەنووسێ و بڵاودەکاتەوە. ئێستا خوێندکاری فەلسەفەیە لە زانکۆی ستۆکهۆڵم. جگە لەمانەش وتارو رانان لەسەر فیلم و شانۆ دەنووسێ لە ماڵپەڕی www.slynglar.com .

## شەپرگەکانی بەیانی

زەوی لە فنجانێکی بچکۆلانەدا دەخوێنمەوە
پەیڤینەکانی نێوان من و دەریاش
لە هەڵەتەبوون!

زەردە مرۆڤی رەش، سوور،کەسک
پەرتەخەونی شین، سپی، پرتەقاڵی
یەکتر دەخۆن!
لەنێوانیاندا.. گومانی ئاوو
منداڵیم..
گومانی باران و
بۆنی کۆلانەکان!
ئاوەژوو دەکا.

................................ نیگای دەست

منێک.. لەمنداڵیەوە تەمەنەکانی غەیبی بەدی دەکرد

منێک .. لەمنداڵیەوە هەورەکانی بارانی دەناسی!

منێک.. لەگومڕاییەکانی ئاو..پیتەکانی ژیانی دەخنکاند!

چیرۆکێک تەواو بوو

چیرۆکێکی تر دەست پێدەکا .

زەردە مرۆڤی رەش، سوور، کەسک

پەرتە خەونی شین، سپی، پرتەقاڵی

یەکتر دەخۆن!

منداڵێکی گومانکار

هەلاتووێکی

دۆزەخ.. بەهەشت

بسمیل نەبووێکی دەست

وجود.. عەدەم!

نیگای دەست ..............................

تارمایی ئێوارەیەکی خۆڵەمێشی

جەستە.. ئێوە!

پیتەکانی "ژیان" لێک دەترازێنێ و

ئاویش بەگومانەوە بەیانییەک پێی دەڵێ:

خەوت خۆش ئەی جەنگاوەر!

خەوت خۆش!!!

زەردە مرۆڤی رەش، سوور، کەسک

پەرتە خەونی شین،سپی، پرتەقاڵی

یەکتر دەخۆن !

تەرمی جەنگاوەرەکەش

منداڵێک دەیباتەوە دەم کەنارێکی وون بوو!

هەولێر1995

## ناستینکا

شەوەکان لە باڵەکۆنای قەدەرەوە،

هەورەکان لە دۆزینەوەی ساتەکان،

بۆمنی شوێن

بەفرم بەسەر دەبارێنن.

شەو سپی دەبێ ،

قژی تۆش بەگریانە ناکاوەکان،

لەرامانی وێنەکانی (ئەو) دا.

ئەو گریانەی کە لەپێش هاتنی شەوەکانەوە،

بەر لەهاتنی ئەو لەحزانە دەمبەستت کردبوون،

دەگریای و قژت پەرش دەکرد،

بەسادەیی وەک کچانی گەرەکە میللیەکان و،

ئەسمەرەکانی  باخچەی عەدەن و،

جەنگەڵە مێژوو دارەکان،

دەتپرسی : من جوانم؟

شەو سپی دەبێ،

لەحزەکانیش لە ژووانێکدا لەگەورەییت دەڕوانن،

ئاڵۆز دەبووی و دەتگوت: گەورەییم لەکوێیە؟

شەو سپی دەبێ،

بەفریش ماندوو دەبێ ناستینکا.

لەحزەکانیش سێوێکن،

پیاوێکی تر لەگەڕانەوەی سەفەرەکەیدا دەیخوا.

شەو سپی دەبێ! ناستینکا

سپی دەبێ .. سپی

بەفریش ماندوو،

لەحزەکانیش لەژووانێکدا لەگەورەییت دەڕوانن!

پیاوێکی تر لەگەڕانەوەی سەفەرەکەیدا

گەورەییت دەبا!

هەولێر1998

## کوڕە گەنم ڕەنگەکە و کوکوختیەکەی کۆلیژ

بە "هێمن قادر"ی هاوڕێم پێشکەشە

لە ساتمەی پەنجەرەکەوە چەندەها نیگا بەردەبنەوە
لە سیما گەنم ڕەنگیەگەشت: ئاوڕدانەوە.
کوکوختیەکە نزیک دەکاتەوەو
ئاوی چاوەکانت دەخواتەوە.
بەر لەچوونە ژوورەوەی موحازەرەکان،
دەفتەرەکەت پەڕوباڵی کچە عاشقی بەلەکۆنا دەنووسێتەوە،
نهێنیەکان خڕت دەکەنەوە.
ڕاوەستانە منداڵییەکەت نامەیەکە،
کوکوختیەکە لەودیو پەنجەرەوە
دەتخوێنێتەوەو فڕێت دەدا

## نیگای دەست ..............................

دەتنووسێتەوەو ڕەشت دەکاتەوە!

دوای تەواوبوونی دەرسەکانی *مامۆستای ڕەوانبێژی**

کوکوختیەکە فڕیبوو.

نیگاکان بەپەنجەرەکەوە نووسابوون.

پەڕوباڵەکانیش لە بەلەکۆناکە پەرت ببوو.

سیما گەنم ڕەنگیەکەشت بوو بە کوکوختی و فڕی!

1999 هەولێر

* مامۆستای ڕەوانبێژی: دەرسەکانی مامۆستا (عەزیز گەردی) بوو.

## بەیانیەکان

بەدەم وڕێنەی پەیڤەکان لەناو کتێبەکان بەجێمام،
لەسەر پەیژەکانی خەیاڵیش پەپوولان سەفەریان کرد؟!
کات بەرەبەیانێکی فەرامۆش کراوبوو،
کچە هونەرمەندەکە،
هەموومان لەجوانیدا لەو ساتە فەرامۆشکارە دەچین؟!
یان وەک بۆشایی لەنێوان پەنجەکان و ڕەنگەکان،
یان لەو ئارامییە پاقژە ئاوییەوە،
کە ڕەنگی نیە؟
تەواودەبین !

تۆ.. لەوێ لەدەرەوە
لەناو گەمەی ئەو ڕەنگانەوە
وەک منداڵێکی لاسار پێدەکەنی!
بەیانیەکان لەناو بۆشاییەوە
پرسیارەکانی بۆ تامەزرۆیی ئاوەڕوو دەکرد
تۆ.. لەوێ لە دەرەوە
لەناو گەمەی ئەو ڕەنگانەوە
وەک منداڵێکی لاسار پێدەکەنی !

دەرفەت نامێنێ ، ئەو بەیانییە جێماندێڵێ
ئەو جوانییە مەحف دەبێتەوە!
دەستی قەدەر پەلکێشمان دەکات، کەیلی سەراب دەبین

کچە ئەسمەرەکە!
ئەو بەرەبەیانە رەنگەکان رەنگ دەکاو
دیوارەکانی زانکۆ وەک دیوارەکانی هەناسە
هەناسەکانی سوار دەبێ!

ئەو تەنیاییە...
لەسەر مێزی نێوان من و برادەرەکەمدا
گوڵدانی وەهمەکان گومیان دەکا
بزر دەبین ... بزر دەبین
لەناو بۆشایی، لەناو رەنگەکان بزر دەبین !

*ماریا دوو دەنکە ترێی ناو تابلۆی
ئەو کچە هونەرمەندە بوو
بەرەبەیانێکی زوو ... زۆر زوو لەناو نامەکاندا هەڵەتەی دەکردن !

* دەستەکانی ئەو کچە ئەسمەرە رۆژهەڵاتییە
هێشتا مابوو گەز گەز لاسکی پەیڤەکان رەنگ بکا
من لەوێدا گۆرانی شاعیرێکی نادیارم

دەخوێندەوە !

پێیەکانی هێشتا هێشتا مابوو بگاتە ژوورەکە

من لەوێدا لەسەر سەبوورەکەوە

ناویم رەنگ کردا

* بەرەبەیانێکی زوو بوو ئەو هات،

نینۆکەکانی رەنگ کردبوو،

نەک ئەو بۆشاییە.

* ئەو کچە ئەسمەرە رۆژهەڵاتییە

ئێستا هەموو بەرەبەیانانی زوو

لەگەڵ ماریا،

لەگەڵ پەپوولان،

لەگەڵ ئەستێران،

سەفەر دەکەن .

لەنامەیەکدا ناو لەپی خۆی بۆ نووسیم،

کە هەموو بەرەبەیانیان لەگەڵ ماریا

لەناو گەمەی رەنگەکان وەکو جاران پێدەکەنن و

ئەوانیش زوو... زوو

یەکتر بزر دەکەن !

## نیگای دەست ..............................

* کات بەرەبەیانێکی فەرامۆش کراوبوو،
کچە هونەرمەندەکە،
هەموومان لەجوانیدا لەو ساتە فەرامۆشکارە دەچین؟!
یان وەک بۆشایی لەنێوان پەنجەکان و رەنگەکان
یان لەو ئارامییە پاقژە ئاوییەوە،
کە رەنگی نیە؟
تەواودەبین !
لەکامیان تێر یەکترمان خۆش دەوێ ؟
لەکامیان یەکتر بزر دەکەین؟!

2000 هەولێر

## تانــۆ

من بەدیار ئەو ئەستێرە ئاسنینانەوە
تەنێ بێهوودەو
تەنێ سەرمەست و
تەنێ ئاوەژووم
ژوورەکەت پڕە لە ئەستێرەو
تەنێ گومانکارو
تەنێ دوورو
تەنێ عاشق
تانۆ.. ئەو دیوارانە بەخوێنم رەنگ بکە!

سەعاتەکەم خستە ناو ئاو،
خۆم بە کاتێکی نادیار سپارد.

شار لە من وەڕسە،

ئاسمان ڕەگێکی لە من و بوونێکم لەو

خەونەکانم بە "ماریا" دەسپێرم،

کە بەیانی هەڵسا بۆت بگێڕێتەوە.

پشیلەیەکیش پەڕ و باڵەکانی خۆشەویستی بەدەمەوە گرتووە

شار لە من بێگانەتری تێدا نییە،

ئەرێ کات چەندی بەیانییە!

پشیلەکە بۆنی جەستەم دەکاو

منیش لە ناو بزربوونی ئاسماندا،

پەرێشانییەک قوتم دەدا

ئەرێ کات چەندی تەمەنە!

تۆش نامەکانم هەڵگرە،

لەوێدا کات چەندی زەمەنە تانۆ!

## نیگای دەست ...............................

وەک ئەستێرەیەک بە ناو رۆمی کۆڵانەکان شۆڕدەبمەوە

باران جەستەم دادەکوتێ،

نیگا مەییوەکانم گلۆپی ماشێنەکان ئەبڵەقیان دەکا.

پێیەکانم بە ناو تاریکیدا دەڕۆن

بە توڕەییەکەوە رۆژئاوا سێبەرم دەتۆقێنێ

ئەرێ کات چەندی رۆژهەڵاتە!

ئەستێرەیەک لەوێوە دێ، لە رۆحم دەچەقێ.

دووری نێوان من و با

دووری نێوان من و پێکەنینەکانی تانۆ

دووری نێوان من و رۆژئاوا،

دووری نێوان ئەوو رۆژهەڵات.

فرمێسکەکانم قووت دەدەم.

## نیگای دەست ..............................

ئەرێ کات چەندی تەکنەلۆژیایە!

لەوەدەچێ تانۆ گەمە بە پەڕەکانی ئەستێرە بکاو
دیواری ژوورەکەش، ببێتە گومانکارێک تێڕامانەکانی منی تێدا
جێبێڵێ
ئەرێ کات چەندی ماوە گوێم لە دەنگت بێ!
ئەستێرەکان باوێشکیان دێ،
خۆت کۆدەکەیەوەو بەبێ ئەوەی ئاوڕ لە رۆژهەڵات بدەیتەوە
پشیلەکە دەرگا دەکاتەوە
تۆش وەک بوونێک لە خۆت دەترازێی
ئەرێ کات چەندی خۆشەویستییە!
ئەستێرەکان دەخەیتە گیرفان و
لەسەر پەیڤێک دەڕسکێی
ئەرێ کات چەندی ئەستێرەیە تانۆ!

نیگای دەست ..............................

دەنگم لە ناو ئەو ئاسمانە تەکنیککارە دەلەرێتەوە

کات چەندی تانۆیە

تانۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆ!!!!

2003 هەولێر

## پێکەنینی ئەستێرەیی

نینۆکەکانم لەسەر ئەم زەوییە،

هەڵدەوەرێنم و وڕێنە لەگەڵ (با)وە دەکەم.

من پێم خۆش بوو تۆ وا پێدەکەنیت!

پەڕەمووچی باڵدارێکی مێینە دەخەمە سەر لووتت

..پێدەکەنیت

لە تاریکە شەوێک دێم بە پەنجەکانم

یاری بە شتە حەرامکراوەکانت دەکەم.

بەدزییەوە پەنجە دەخەمە سەر مەمکت

..پێدەکەنیت

باسی چاوەکانت ناکەم .. دەمێکە لەوێ میوانم

تیچاوێکت تێدەگرم

..پێدەکەنیت

## ................................ نیگای دەست

لە بەرامبەرت دادەنیشم و دەتخوێنمەوەو تورە دەبم

تۆش پێدەکەنیت

رادەمووسێین پرتەقالێک بە نیوە بەش دەخۆین

هەندێک لە بەشەکەی منیش دەخۆیت و

..پێدەکەنیت

پێدەکەنیت..

تورە دەبی!

نۆڤەمبەری 2004 سلێمانی

## دوکەڵ

لە جیاتی رەسمی یارەکەم و

گوڵ و پشیلە،

ژوورەکەم پڕ دەکەم لە دوکەڵ!

30–9–2004 سلێمانی

## تێڕوانین

میوزیکەکە دەنگی بەرزە،

پەنجەرەکەش بارانێکی بەخوڕ ئامێزی گرتووە.

دەنگم پێتناگا،

لە شۆستەکەی ئەم بەری ئاسمانەوە

وەک پەیکەرێکی کۆنی کۆڵان چاوەڕوانم.

28–11–2004 سلێمانی

# *MSN

هەستەکانم پەنجەکانم رایاندەکێشێ،

چاوەکانم پەیڤەکان دەستەمۆیان دەکا

دڵیشم چاوەڕوانی دەنگی هاوڕێکەم.

کات نۆی شەوە،

دەرەوە باران داپۆشیوە

لە ناوەوەش رەنگی خۆم.

کات دوازدەی شەوە،

چاوەڕوانی دەبێ بە شەڕانگێزێکی ترسناک

پەنجەکانم لە شەڕگەیەکی بێ چارەنووس دەبن.

کات درەنگی شەوە،

کات دێت و دەڕوات

لەسەر مێزەکە بەدیار ئاوێتە بوونی

پێکەنین و شەڕەوە

خەونێکی خۆش دەبینم.

کات بەرەبەیانێکی زووە،

نامەیەکی تازە دەخوێنمەوە

هاوڕێکەم بە هەڕەشەیەک پەنجەکانی بڕیوم!

3-12-2004 سلێمانی

*پرۆگرامێکی (چات)ە لەسەر ئەنتەرنێت، کە مرۆڤ تێیدا گفتوگۆ دەکات، جارجاریش شەڕێکی بەلەززەت.

## لە دایک بوونی تانیا

دۆزینەوەیەک عەشق واژووی دەکا،

لە دایکبوونێک عەشق،

تورەبوونێک عەشق،

من و تۆش عەشق ئاشتمان دەکاتەوە.

تاوناتاوێش شەڕ.

کاتێک پەنجە بچووکەکانت لە هەوڕ رادەما،

لەودیو نمەکانی بارانەوە،

لە تێکچڕژانی هەناسەکانم لە دایک دەبوویت.

لە بنمیچی ئەو ئاسمانە لێڵە تۆم دۆزییەوە.

تۆش لە نیشتمانی بوون من.

لەم گەڕانە بێهوودانە،

تۆ دەمێکە لە دایک بوویت!

نۆڤەمبەری 2004

## تانیا و هاوڕێکانم لە پەیوەندییەکی شیعریدا

کات لە نێوچەوانی من و ڕەنگی (تانیا)دا دەتوێتەوە.

من لۆچەکانی دەم و چاوم گۆشەگیرتر دەبن ،

(تانیا)ش تێیدا دەتوێتەوە .

مانگەشەو ناسنامەم ون دەکا،

لەپی خوێناویشم دۆشداماوە ،

چاوەڕێی تولە ڕێ دەکا.

نیرگێزێک بۆ (کۆستنامە)ی شاعێرێک دەنێرم،

هەڵگری نامە بەدەم خێرایی باوە بۆم دەگەڕێنێتەوە ،

بۆم دەنووسێت :

ببوورە کە ناونیشانی دیار نییە.

کات لە ناو دوکەڵی جگەرەدا مەست دەبێ و ،

منیش لە تاو میلی سەعاتەکە چەند جارێک خۆم دەکوژم.

لەسەر باڵی شەمشەکوێرەیەکدا نووسینی پڕ لە نهێنی هەیە ،

دایکم دەڵێت :

شەوان بەدیارییەوە مەوەستە،

با لەسەر سەرتا نەڕژێ و ئۆباڵی کاتت بەسەردا نەکەوێ!

بە ناو وشە تاریکەکان دا دەڕۆم،

جەستەی شەکەتی کات دەخوێنمەوە.

باوکم وتی:

ئەو وشانە حەرامن مەیانخوێنەوە!

لە نێوان دایکم و باوکم،

نزیکبوونەوەی حەرامکراو هەیە!

## نیگای دەست ..............................

لە نێوان کاتەکانی باوکم و دایکم ،

دیلێکی بەخشندە هەیە!

خۆم لە ناو ئاپۆرەی ئەو کاتانە دەدۆزمەوە.

هاوڕێکانم لە شەوانی سەر مێز دەبینمەوە.

(هەندرێن)یش لە توڕەبوونێکی وەنەوشەیی،

بەسەر فەزای ژوورەکەمدا ورژوم دەکاو،

هێلی ئاسمان .. دەم نادەمێ دەپچڕێ.

تووڕە بوونەکان هێور دەکاو بەتاوتر دەکا.

لۆمەی کات تا دێت رەنگم تەڵختر دەکا،

لە ناو گیرفانەکانی (تانیا) هەڵدەچم.

مانگەشەویش چاوێک لە ناسنامەی ونبووم دادەگرێ و ،

سەر لە نوێ خۆم و برا و هاوڕێکانم یەکتر سەر دەبڕین!

نیگای دەست ................................

خەونەکانیش لە ناو زگی ئاسمان،
لە گەمەیەکی خۆشدا مەلە دەکەن!
(تانیا)ش لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا،
رەنگی دەمەیێ و دەنگی دەبەستێ !

سلێمانی 4-6-2005

## سوورهەڵگەڕانی پەنجەکان

وردە گەندە مووەکانی سەر سینگت،

بۆ پەنجەکانم تایەکی قورسیان گرت بوو.

لە پەنجەرەی کراسە سوورەکەتەوە،

پەردەیەکی شەرم هەڵدرابوو..

لەبەردەم (با)وە ،

ناومت نەدەهاتە سەر زمان!

(با) وەک باوکێک دەمارەکانی زمانی گرتبووی!

کۆتری مەیلت فڕی،

ناوی منیشی بە یادگاری لەگەڵ خۆی برد!

ئاسمان ئەستێرەی لێدەڕژا،

پرچی تۆش خەونەکانی من!

خاکی جەستەم برینی لێدەڕوا،

بینینی تۆش ئازار!

ڕەنگم لە چەشنی سەرابێک لێڵ دەبوو،

شەرمی تۆش هەرتەشی چوو!

کاتێک وێنەی مەمکەکانت لە ئاوێنەدا دەبینی،

خۆت دەهاتەوە یاد.

مەیلەکانی من وەک بوونێک

پیاسەی لەسەر دەکرد!

................................ نیگای دەست

لەودیو ئاوێنەوە،

خۆت دەهاتەوە یاد.

پەنجەکانم لە سوورهەڵگەڕانێکا دەڕەوینەوە!

2005–6–21 سلێمانی

## گوڵە سوورەکان

بۆ : محەمەد سیتۆ

گوڵێکی سوور لەسەر ناوونیشانی

ئەدرێسی داخراوو،

سەر دەفتەرەکانی تۆزلێنیشتووی یادەکان و ،

هەستی گیرۆدەمان جێماوە،

پەنا بۆ چەند وشەیەکی دزراو دەبەین.

قاچەکانمان راماندەکێشێت و،

ناوونیشانە خەیاڵییەکانمان پۆستی تازەیان بۆ دێت و ،

میوانداری شەکەت بوونێکی تازە دەکەین.

دانیشتنەکان لێرەو لەوێ کۆمان دەکاتەوە.

گوڵە سوورەکانیش لێرەو لەوێ لێکمان جیا دەکاتەوە!

تۆ لە ماندووبوونێکا لە خۆت جیا دەبیتەوەو،

لە پیاسەیەکی ئەو کۆڵانە نامۆیانەش سێبەری خۆت دەدۆزییەوە.

خوێن بە نێوچاوانتا گرمۆڵە دەکاو،

دەفتەرەکەت بەسەر چاوتا دادەخرێ،

بەیانیانیش قاچەکانت بەرەو فەنا بوون دەتبا.

ئێوارانیش..

خۆت وەک جانتا کۆنە هەڵواسراوەکانی قەیسەری هەولێر دەبینی،

دەگەڕێیتەوەو لچکی عەبایەکەی دایکت دەگری و ،

منداڵی و یادەکانی خۆت کۆ دەکەیتەوە.

جانتایەک بۆ سەرەتای چوونە مەکتەب دەخەیتە سەرشان!

گوڵە سوورەکانیش جێدەمێنن.

ناوونیشانەکانیش ونت دەکەن و ،

... نیگای دەست ...............................

ئەدرێسە تازەکانیش سەرت قاڵتر دەکەن.

پەنجەکانیشت سڕ دەبن بە دیار تایپی نامە تازەکانەوە.

گوڵە سوورەکان!

ئاخ بۆ گوڵە سوورەکان !

نە کوردن، نە ئەرمەنی، نە تورک ، نە عەرەب،

هیچ زمانێک پێکیان ناکات و ،

ئێواران لەسەر مێزەکەتەوە خۆیان دەنێژن!

2005-6-6 سلێمانی

## لە کاتێکی ڕەوینەوەی هەورەکاندا

پەیڤەکانم وەک پێکیکی درەوشاوە مەستت دەکا،

دەتباتەوە بۆ ئەو کۆڵانە تاریکانە،

کە دەمێکە پیاسەیەکت تیایدا نەکردووە.

تۆش بە هەوری دوکەڵی جگەرەکانت

من هەڵدەمژیت و،

لەسەر لێوت وەک گوڵە هەنارێک دەڕوێم.

پێکی پەیڤەکان کاتەکانمان ڕاو دەنێت.

من لەمسەری دوورگەکان تۆ دەنووسمەوە،

تۆ لەوسەری هەورەکان پەرتم دەکەیت.

کە پەنجەرەی ژوورەکەت واڵا کرد.

کە دوگمەکانی سینگت لێکترازا.

جلی شەو خۆی بەبەرتا پۆشی،

خەیاڵی ژوورەکەت خەو بردیەوە.

هەورەکانیش پەرش و بڵاوەیان کرد،

لەسەر شان و ملی جلی شەویشا،

پەپوولەکان بوون بە خاکێکی گوڵ گوڵی

پێکی مەستیان لێدادەچۆڕا.

–تۆش لە ناو خەوا گوم بوووووی!!

سلێمانی / 26–6–2005

## نینۆکەکانی

لە شەوێکدا ..

بەسەر سینگی یەکتردا رژاین.

نوکە ئەستێرەکانی،

بەسەر جەستەی زبریما دەهات و دەچوو.

لە شەوێکدا..

بەسەر لاشەی یەکتردا دەخشاین.

بە نینۆکەکانی،

نیشتمانی پشتمی دەکێڵا.

لە شەوێکدا..

دوای هەر قومێ لە هەڵدانی پەیڤەکان،

## نیگای دەست ..............................

نینۆکەکانی رەنگ دەکرد.

لە شەوێکدا..

دوای تەواو بوونی میواندارى لێوەکان،

بە نینۆکەکانی،

گەمەی بە گژو گیای

نیشتمانی سینگم دەکرد.

سلێمانی /2004-6-29

# گەرمی وجود

بۆ: ژنێتی شیعر

هەورگەلێک لە پەنجەرە کۆنەکەت ڕا
پەنجەکانی یاد تەڕ دەکا،
تۆ لەوێ مشتێ وشەی ئەفرین بووی،
تامی زارمت گەرم دەکرد.

شەوگەلێک لە باوەشی مووە بە بریسکەکان
هەست و پەرێشانی لە ئامێز دەگرتی،
تۆ لەوێ پارچەیەک لە پەراسووم بووی،
وشەکانم دەنگی گەواڵەیەک بوو،

نیگای دەست ..............................

دەرژایە ناو گوێت و بوونتەوە.

لە ناو رانمدا گەرم دەبوویتەوە.

ماچگەلێک لەسەر کەناری لێوەکانت

بوون بە باڵندە وەرزاو وەرز رووی تێدەکردنەوە.

هەنیەت لەبن پەچە رەنگاورەنگاوەکان،

گەرمی لێومیان هەڵدەمژی.

چاوگەلێکی روانینەکانت رووناکییان

لە چاوەکانم دەدزی.

روانینەکان لەسەر گۆشت کۆدەبنەوە،

پەنجەکانم لە بناری مەمکت شین دەبوون.

ئەنگوستەکانم گەرمی لە هەتاوی

ئەو بنارەی تۆوە بە جەستەم دەبەخشی.

## نیگای دەست

نووسینەوەکان: دڵۆپە نارنجییەکانی

سەر مەمکت بوون.

کە مەست دەبووی ژنێتی شیعرت

گەرمی وجودمی بۆ لای خۆی پەلکێش دەکردا

کە خۆت رووت وەک پەیڤەکان نیشان دەدا،

هەتاوی جەستەت گەرمی دەکردمەوە!

2005 سلێمانی

## ئیمـزا

ئەودیو باخچەکەی ئاسمان: جێژووان.

ماچی چاوەکانی ئەوێش: دەستنوێژ.

ئەودیو سوخمەو کراسەکان: بەرماڵ.

دەستە هارەکانی من و تۆش: لەنجەی وجود.

ئەودیو وشە تەڕەکانی خۆشەویستی:

ئاوی ناو ران.

تێکئالانی شەوەکانی من و تۆش:

ئیمزای گەردە قاچاغەکانی شەهوەتی بن زمان!

سلێمانی 4-7-2005

## هەناسەی مەمکەکانی

پەنجەی پێیەکان لەسەر کوێستانزەمینی تۆدا،
بوونێکی مزر لەناو مندا چێدەکا.

ئێواران هەتاوی سەر سینگت دەڕازێ،
کراسەکەت لە خۆرئاوا بوون دەچێ.

کە لێوت وەک هەنارێک ڕەنگ دەکەی،
ژیان، تامی بوون لە شەقامەکانی ڕۆژهەڵات
بەرجەستە دەکاتەوە.
مەمکت وەک کتێبە پیرۆزەکان،
لەسەر یادەوەرییەکانی سینگتدا،
دەقێکی کراوە لە ڕۆحم دەچێنێ.

## نیگای دەست ..............................

لیکی ناو دەمت لەززەتێکە،

ئەستێرەکان دەستنوێژی پێهەڵدەگرن.

توانەوەی ئارەقەی سەر گەردەکانی جەستەت

شەهوەتێکە،

فریشتەکان دەرسی لەسەر دەخوێنن.

بەر لەوەی ریشگەلەکان بە نووری گوللەکانیان

پەرتمان بکەن.

– بە هەناسەی مەمکەکانت تیرۆرم بکە!

2005 سلێمانی

## سەعاتەکەی ژوور سەری تانیا



ئێرەو ئەوێ دوو کاتژمێر دەنگمان لێک دوورە،

من بەدیار چەرخێکی کۆنینەوە، هەناسە دەدەم.

لە ناو تاریکیدا چاو بڕ دەکەم.

مۆدەکانی ژیان،

چەند سەدەیەک دوای ڕشانەوەکانی ئەوێ بەمن دەگا.

لێرە، من دوو سەعات بەر لە تۆ ئەستێرەکان تاوم دەدا.

ئەستێرەکان لێرە بریسکەیان پێکەنیناویترە.

وەک تۆپەڵە قوڕێکی بەر خۆری

نیگای دەست ..............................

دین و

دەسەڵات و

مێژوو

بوونم سەقەت و خوێناویترە

دوو سەعات ڕەنگمان لێک دوورە

ئێرە.. فۆبیای بێ کارەبایی و

مەوتەنی تاریکی چاوو

گەردەنی تۆزاوی شارە ناشارەکانە.

ئێرەو ئەوێ، دوو پەنجەرەی تاریک و ڕوونە.

بەیانی من، دوو سەعات بەر لەتۆ رادەبێ.

ئێوارەی من، دوو سەعات بەر لە تۆ ئاوا دەبێ.

بوونیشم دوو سەعات بەر لە سڕینەوەی بوونی تۆ

کۆتایی پێدێ.

هەوری ئاسمانی ئەم نیشتمانی ئێرەیە،

## ................................ نیگای دەست

بە تووڕەبوونێکەوە دادەکاو

براگەلەکان بە سەنتووری برایەتی

لەعنەت لە کات  دەکەن.

سەعاتەکەی ژوور سەریشت

دوای دوو سەعات ژیانی پڕ لە کارەساتی ئێرە

خەبەرت دەکاتەوە!

2005 سلێمانی

## دەستنووسێکی کۆنی مانگ

1

لەودیو ئەو درەختانەوە: سێبەر.

لەودیو ئەو دەرگایانەوە: پۆلیس.

لە گیرفانی پیاوانەوە: شەڕ.

لە ناو جانتاکەی ئەویشدا: چوکلێت و سووراو.

2

لەودیو کاتەکانی بەیانی: جەنگ.

لە ماڵی ئەو پیرەژنە سەوداسەرە: حیکایەتەکانی ساڵ.

لە ناو دۆڵەکانی یادەوەری شاخ: پەشیمانبوونەوە.

لە نیگای پەنجەرەکەی ئەویشدا: چاوەڕوانی.

3

لەسەر لێوڕەنگی کیژۆڵەیەک: تامەزرۆیی ماچ .

لە دیاری نامەی کوڕێک: پاڕانەوە.

لە تکانەوەی دەرپێی منداڵ: بۆنی ژیان

لە چاوەکانی ئاییندەی ئەودا: ڕشانەوە.

4

لەسەر ئێوارانی مەمکی کچان: غەریبی پەنجەکان.

لە شافی بزنەکان: غەزەبێکی بێهوودە.

لەسەربانی قەدەری منارەو مزگەوتەکان: سەرگەردانی کلیلەکانی بەهەشت.

لەسەر دەسەسڕەکەی ئەودا: پژمینێکی توند،

سەفەرەکە وەسوەسەی تێدەکەوێت و پاسپۆرتەکەی دەدڕێنێ!

5

لەژێر بەتانی و پەتووە نەرمەکان: خەونی نادیار.

لە بەلەکۆنای نیگای بیرکردنەوە: دڵۆپی فرمێسک.

لە هاوڕێیەتی کچە چاوکاڵەکان: ئیرۆتیکا.

لە پەیمانی رووتبوونەوەی شەوەکان: زایەڵەیەکی شێواو.

لە زەنگی دەرگاکە: چاوەڕوانی دیدار.

لە ناو دڵی ئەویشدا: پەرێشانی.

لە پەرێشانیش: ونبوونی جانتاکەی ئەو.

لە ونبوونی جانتاکەی ئەویشدا: کاڵبوونەوەی رەنگی زەردەپەڕ.

لە کاڵبوونەوەی رەنگی زەردەپەڕیش: ئێوارانی کوژانەوەی پێیەکان.

لە ئێوارانی کوژانەوەی پێیەکانیش: بێگانەبوون.

لە بێگانەبوونی ئەویشدا: دەستنووسێکی کۆنی مانگ.

سلێمانی 2005

## باخچەیەک لە هەتیوی

دەجەنگم، تا تۆ تریقانەوەت لەسەر ئەم زەمینە بەردەوام بێ

**بۆ: ترێیەکانی ماریا**

هەر دوێنێ بوو، شەڕگەکان بەسەر لاشەی یەکتردا دەکەوتن.
هەر پێرێ بوو، دارە پیرەکان لە مەستیدا سێبەریان فڕی.
هەر ئەو رۆژە بوو، کە تۆ لەسەر سینگی مندا
بە حەیرانەکان گریانت لە بیردەچۆوە.
لە هەتیوی مندا لەدایک بوویت.
کراسە سپییەکەت شەربەتی مێوژی بەسەردا دەڕژاو،
سەرینەکەت مەمەکانی لەسەر پەرت دەبوو.
ناو جێگاکەشت هەتیوی منی تێدا گەورە دەبێ.

هەر ئەو ساڵە بوو، باخچەکەت پڕ بوو لە ترێی چاوەکانت.
نیگاکانیشت لەسەر ئەم زەوییە تۆراوە، تۆرا.

وەک کەروێشکێک پەرێشانی کات بووی.
دەنکەترێیەکانت، هی ئەو ساڵە کۆنە بوو
کە لە باخچەیەکدا بەسەر شان و ملی مندا هەڵگەڕا.

گەر هەر جارێک هاتمەوە،
زەمبیلەیەک لەو ترێیانەم بۆ هەڵگرە.
لەگەڵ هەر پێکەنینێک
دەنک، دەنک دەیخۆین و،
بەدەم خواردنەوەی شەربەتی دانیشتنەکان،
سۆندەکە بێنەو، وەک گەمە هەمیشەییەکان،
باخچەکەی هەتیوی هەردووکمان ئاو بدە !

سلێمانی 18– 7–2005

* ماریا: کچێکی تەمەن شەشساڵانە، ئێستا لە کونجێکی باوەشی دایکم ژیان بەسەر دەبات.

## هەرای ناو چەرخەکان

له هەموو سەردەمێک و چاخێک دەستنووسەکان ئیسماعیلێک بوون
با ئەمڕۆش، ئیسماعیلی دەستنووسەکانی تۆ  قوربانی بە پیاوەتی بوونی ئەوان بێت.
با ئەو ئاسکەش، مێنازی خۆی لە ئاسمانی نووسینەکانت خەت خەتی شیعرت ببزوێنێ!

**بۆ: حەمە عەباس**

ئەو ئاسکە چەندین چەرخە،
لە سێبەرەکەی خۆی رادەکا.
بە ناو گەرووو،
دۆڵی تاریکی قسەکانی مندا
شۆڕ دەبێتەوە.
لە شەڕە گەورەکان، کە نەنووسراونەتەوە
سێبەرەکەی برینێکی گەورە
بە شمشێرەکەی قەیسەرێک کونبەدەر کرد.

هەرایەک لەسەر پشتی راکشاوی شەودا،
چەندان پیلان و
چەندان دانووستان و
چەندان گەمارۆدان
بۆتە ئەم پیاوە دەمارەکانی پەیڤینت دەگرێ.

ئەو سێبەرە بوو بە هەزارەی سێیەم
لەسەر ئەو گەڵایە پیرانە
چەندان هزرو
چەندان هەست و
چەندان پاکیزەو
سەردەبڕێت و نوشتەی پیاوەتی بەملی وەدەکا!

ئەو سێبەرە بوو بە درۆیە هەمیشەییەکانی بوون
لەسەر لێوی منداڵێک کۆدەبێتەوە
چەندان ترس و

چەندان خۆشاردنەوەو

چەندان بورکان

کپ دەکاتەوە.

ئەو ئاسکە چەندین چەرخە سێبەرە بریندارەکەی لێنابێتەوەو

چەندین چەرخە تەنیایی،

ژوورێکە لە ئەشکەوتە کۆنەکانی ئەوێ

بوونێکە لە پێکانی شمشێرەکەی قەیسەر

بزمارێکە لەسەر ڕۆحت شین دەبێ.

پێیەکانی ئەو ئاسکە، وشەکانی ئەو سەردەمەیە

کە لەبەر چاوت دێن و سەری دەبڕن و

لەبەر چاوت وەک قوربانییەک

بۆ لە ناو بردنی ئەو غەزەبە مرۆڤگرە

بەسەر جیران و

گەڕەک و

شارەکان

دابەشی دەکەن!

ئەو ئاسکە چەندین هەزار ساڵە لەو کێوە عاسێ بووە.

لە ئاسینەوەیەکدا ئاهونزای مانگ دەبینێ و

چەندان جار بە شاخەکانی

لا روومەت و

نێوچەوان و

گۆنات ماچ دەکا.

کاتێک یەکەم شەڕ هەڵگیرسا

ئەو وەک مێنازێک لەو شاخانە سەرگەرمی لەنجە بوو

بە هەڵبەزینەکانی شیعری راڤە دەکردو

بە چاوەکانیشی مێینەی پێدەبەخشی.

هێشتا ئەو سێبەرە بوونی نەبوو

قەیسەر لە ناو هێلکەی ژندا لەسەردەمی تروکان نەبوو.

## نیگای دەست ..............................

کاتێک کە دوا شەڕی ئەم چەرخە
بە ڕەتکردنەوەی دەستنووسەکانت هەڵگیرسا
ئەو ئاسکە لە شاخێکا پێش خۆ هەڵدێران
نامەیەکی بۆت نووسی:
کە سێبەرەکەی لەودیو هەناسەکانی خۆت هەڵبواسی.
ئەو کێوانەش..
لە مۆزەخانەی یادەوەریتا بە هارمۆنیایەکی کزی میوزیک
تابلۆی ئەو سێبەرە نمایش بکەیتەوە.

2005 سلێمانی

## تەڕبوونێک لە چاوەڕوانی "پاس"دا

لە چاوەڕوانیدا، باخچەکەی سینگت

بۆنیکەو، غەریزەکانم مەست دەکا.

لەسەر لێوت ئیشارەتێکی کورت .. زۆر کورت

هەزاران مانای زمانەوانی لێدەئاخنێ.

لە تیلەی جارجارەی نیگاشتەوە،

هەورێک لە چاوەکانی من،

بارانێکەو تەڕت دەکا.

لە دوا چرکەکانی سواربوونی "پاس"یشدا،

چامەیەکی خواحافیزی،

لەسەر ئەو شەقامە بێناوونیشانە پەرش و بڵاو دەبێتەوە.

2005–7–29

سلێمانی

## ئاسمانەکەی ئەودیو!

### لە نێوان تۆی "ستۆکهۆڵم" و منی "سلێمانی"دا

من لەودیو شەبەنگەکانی هەتاو،
تۆ لەودیو بازنەکانی بەفر.
مۆنیتەرێکی بچکۆلانە لەسەر مێزەکە داگیری کردووین!
من بە سوعبەتێکی ناسکەوە لە ناوت دەپرسم،
تۆ بە زەردەخەنەیەکی تەڕەوە.

من بە لەززەتەوە پرسیاری رەنگی چاوت دەکەم،
تۆ بە ئەشقیابوونەوە پرسیاری کەچەڵ بوونم.

من دانیشتووم و پەنجەکانم زەرد بوون لە دوکەڵ،
تۆ هەنسک دەدەی و چاوەکانت رەشکاویان لێتدەکێ.

## نیگای دەست ..............................

من دەنووسم و پرسیار .. مێژووم بیردەباتەوە،

تۆ خۆت ون دەکەی و دەنگت نامێنێ.

من پەنجەکانم رووت دەبنەوە،

تۆ مەمکەکانت تەزیون لە چاوەڕوانی.

من بە نامەیەکی ئەلیکترۆنی هەناسە دەدەم بە ژیان،

تۆ بە شەهوەتەکانت نیگای مانگەشەو دەدزی.

من زەنگێکت بۆ دەنێرم،

تۆ بێدەنگییەک.

کە دێیەوە، غەریبی خۆمت بۆ دەردەبڕم،

## ................................ نیگای دەست

کە دەڕۆی، ماچێک لەسەر لێوم بەجێدێڵی.

من پەرێشانی سەر کورسییەکە بووم،

لە نیزامی گەردوون بچینە دەرەوە.

تۆ پەرێشانی پیاسەیەک و رووتبوونەوە بووی،

لە نیزامی قسە کردنەوە، بچینە ناو چوارگۆشەی جوولەوە.

تۆ سێبەرت ون بوو لە ئاسمان،

من کزبوونەوە داگیری کردم.

تۆ دەنگت وەک بەفر چلوورەی بەست،

من کورسییەکەم بە تەنها لەگەڵم بێدار مایەوە!

سلێمانی 7–8–2005

## عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا



ژیان

ئاوو ئاو

دەڕوا

## ئاوی مەزن

## تکایە کەس لە ماڵ نییە

تۆ لە خەیاڵی دڵۆپە ئاوێ

وەرە ژوورەوە

دڵۆپە ئاوێ کە پڕە لە خەون

پڕە لە ترپەی تەنیایی

ئارام .. ئارام

لە سەر ریتمی پیربوون دێ

لە دەرگای نیشتمان دەدا

چەشنی شیعر.

دڵۆپە ئاوێ کە پڕە لە وەهم

دوای مناڵبوونەوەی بە دوعای بەرزی

گریان

دوای بەندکردنی مەلەکانی یادەوەری

لە بەر دڵی کزی مێژوو

دوای کردنەوەی لاپەڕەکانی خۆشبەختی

بە ئومێدی فڕین

دوای ئومێدە کوژراوەکانی نیشتمان

لە بێهودەیی گفتوگۆ

دوای گیان کێشانی جوگرافیای

خزمایەتی

فەرهەنگی مناڵی و شیعر

لە بەر دڵی راستی دەریا

دوای داگیرسانی ئاوێنە

غەریبەکانی عەشق بوون

دێ وەک چۆلەکە لە پەنجەری وڵات دەداو

لە ژێر لێوانەوە دەڵێ:

ئاو لێڵ مەکەن...

ئاوی مەزن.

دڵۆپە ئاوێ کە پڕە لە وزەی شێت بوون

پڕە لە ئاژاوەو دوودڵی

ئێوارەیەک لە سەر تەرمی لاری پێکەنین دێ

تەنیا ..تەنیا

وەک سێبەری شیعرێکی مات.

دڵۆپە ئاوێ کە پڕە لە نامەی خۆکوشتن

پڕە لە غەریزەی سەفەر

دێ وەک دەنگی باڵندەیەکی سەرگەردان

لە شوێنێکی نادیارو

## نیگای دەست

دوور..

شوێنێک بە نیگەرانی لە دەرەوەی زەمەن

دەڕوا..

دەڕوا .. تا هێزی نیشتمان

شوێنێک پێش گفتوگۆکردن

بە دڵ دەڵێ:

شەلاڵم لە ڕەچەڵەکە ڕەش و سپییەکانی زمان

جمەم دێ لە پەشیمانی

بە چرپە بە جەستە دەڵێ:

بە نێو ڕۆژنامەکاندا دێم

خەریکە لە خۆم دەبمەوە

دڵۆپە ئاوێکی

شکاو..

لە



## نیگای دەست ..............................

تە

مە

ن...

نزیک لە رەگەکانی رۆح.

دڵۆپە ئاوێ کە دەڵێی

سەر قاڵییە حونچە ناکرێ

دەڵێی تێنوێتییە قسە ناکا

بە چرپە دێ

چەشنی وێنە جێماوەکانی

دوای عەشق

بە جەستە دەڵێ پەلە کە

خەریکە دڵ لە دڵ بدەم

بە شیعر دەڵێ ئارام بە

خەریکە دڵ لە ئاو بگرم.

تۆ لە رەشبینی دڵۆپە ئاوێ
وەرە ژوورەوە
بەر لە پیاسە ساردەکانی باخچەی ژیان
بەر لە گرەوی خۆکوشتن
بە گاڵتە لە دەفتەری یادگاری نووسی
نامۆ

دڵۆپە ئاوێ
کە لە دەفتەری خەونەکانی نووسراوە:
پڕ بووم لە هێڵکاری ساختەی
چیرۆکەکانی خۆشبەختی
بەر لەوەی عەشق بمکوژێ.

دڵۆپە ئاوێ بە دڵ دەڵێ:
بەر لەوەی ترس لە کۆڵانەکانی نووسین
راوم بنێ
من لە ستایشی ئاوێنە
ژیانم بە هەتاو ناسان.

دڵۆپە ئاوێ
لە دەفتەری پەناهەندەیی نووسراوە
پڕم لە جەنگی شکاوی سەربردەی (با)
سەربردەکانی یاخیبوون
پڕم لە خۆم
پڕتر لە کڵپەی تەنیایی
بەر لەوەی نیشتمان لە کۆڵانەکانی ژیان

راوم بنێ

کچانی ئاو شکۆفە بکەن.

تۆ لە یادەوەری دڵۆپە ئاوێ

وەرە ژوورەوە

دڵۆپە ئاوێ کە پڕە لە سادەیی ئەوین

لە کوچەکانی وەڕس بوون

لە شەقامە ماتەکانی هیچ نەگووتن

لە گۆرانیە داگیرساوەکانی مەحاڵ

باران .. باران

بەو نەختە هەناسە گەرمەی

لە مردن بۆی بە جێماوە

بەو روخسارە راونراوەی

لە ئەفسانەکان کەوتووە

## نیگای دەست .............................

بەو هەموو غەمە وردەوە
کە لە هەنیەی گەرما دەتکێ
دێ لە پەنجەرەی دڵ دەدا
وەک پەپولە
دەگەڕێتەوە چەشنی (با).

دڵۆپە ئاوێ تۆ سەیر کە
وەک ئەوەی پڕ کرابێ
لە لاپەڕە بێ ژمارەکانی بەدبەختی
پڕ کرابێ لەوەی بە یەکجاری
لەگەڵ مەرگ بڕوا
پڕ کرابێ لەوەی بە یەکجاری
بێهودەیی لەگەڵ نیشتمان
دابەش کا

لە دڵی پەنجەرە دەدا
چەشنی باران
هەڵدەوەرێ وەکو گەڵا.

دڵۆپە ئاوێ
کە دەبوو بە دیار شەو دانیشێ و
کەناڵی نائومێدی بکاتەوە
لە سوێی سەفەر
دڵۆپە ئاوێ
کە دەبوو لە نزیک ڕۆژ لە سەرەخۆ
سەما بکا و
ڕستە هەتیوەکانی خۆی لە بۆشایی
دابهێنێ.

## نیگای دەست ..............................

دڵۆپە ئاوێ

کە دەبوو لە گۆشەیەک بنووسێ

دڵم تەنگە

وەکو ئەوەی بڵێ تێنووم

دڵۆپە ئاوێ ماندوو.. ماندوو

چەشنی تەمەن

لە دەرگای نیشتمان دەدا

وەکو ئەوەی بڵێ دەمرم

ئێوەش دەڵێن:

تکایە کەس لە ماڵ نییە؟

تۆ لە پیاسەی دڵۆپە ئاوێکی سەر شێت

وەرە ژووریٚ

پەلە بکە

بەر لەوەی یەکتر ببینن

تۆ سەیر کە

باران ڕۆشنایی پیاوێکی قەدەغەیە

لە نیشتمان

تۆ سەیر کە

باران هەناسەی پیاوێکی ڕاونراوە

لە نیشتمان

ئاسمان دەڵێی بیابانە

نیشتمان پیاوێکی نامۆ.

تۆ لە سکێچی  غەمباری دڵۆپە ئاوێ

ڕامێنە

بەر لەوەی بە دەریا بگەیت

هەر لە تەنیشت بارانەوە پرسیار بکە

## نیگای دەست ..............................

ماڵەکەم لە دوودڵی شەو هەڵچنیووە

بۆ تاقەتترین ئەستێرە لە بری

ئەدرێس بدۆزەوە

بۆ تاقەتترین ئەستێرە لە بری چرا

دەفتەری سووتانەکانی

وەک یادگاری جێ هێشتووە.

بە شەقامی دڕدۆنگیدا وەرە خوارێ

لە دوای پێکی دڵدانەوە

بەر لەوەی خەیاڵی هەڵم

دەستت بگرێ بەرەو مەنفا

وێنە رووتەکانی وڵات

لە پێشانگای خۆکوشتندا کۆکەرەوە

بەر لەوەی ببێ بە باران

## نیگای دەست

بەر لەوەی نیگات تەڕ بێ

ڕوخساری لەت لەت کراوم لە گومڕایی

چەشنی شیعر

دابهێنە؟.

کانوونی یەکەم 2001 هەولێر

## بەد گومانی لەپێشهاتی بارانێ کە نابارێ

دەریاو دەریا
دەچمەوە خزمەتی سەفەر
کۆترەکان بە بادەسپێرم.

دەریاو دەریا
رەش دەچێتەوە نیشتیمان
رەش وەک ئەو شەوە سپیانەی
دەگەڕێمەوە گۆشەی ماڵ.

دەریاو دەریا
پێشهاتەکانی بارانم دەنووسییەوە

## .............................. نیگای دەست

مێگەل لەبەرامبەر تەمتومان خۆی وندەکا
من لە بەرامبەر نیشتمان
بەدگومانی دەخوێندەوە.

دەریاو دەریا
شەو خەونەکان بە با دەدا
نیشتمان دەفتەری مانا.

دەریاو دەریا
میگەل وەک با چنگ  بۆهەڵچوون دەکاتەوە
شەو وەک باران هەڵدەوەرێ
نیشتیمان وەکو بیابان.

دەریاو دەریا

ئاو بۆنی لاشەی میگەلی هەڵگرتووە

ماڵ بۆنی باروت و زیندان.

شەووشەو مێگەل دەبارێ

ئاو بەرەو مەنفا کۆچ دەکا

منیش ورد ورد بەرەو گومان.

دەریاو دەریا

باران زەرد زەرد هەڵدەگەڕێ

بیابان دەنووسێتەوە

منیش نامەی نائومێدی بۆ کۆترەکان.

دەریاو دەریا

لقێکی ئەو بارانە دەچێتە نێو بوون

لقێکی دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕەچەلەکی گەڵا

لقێکی دەخزێ و

لەو دیو بەدگومانی دەریا دەیبا.

گەڵاو گەڵا

بە دەنووکی ئاو دەنووسم نائومێدی

گەڵاو گەڵا زەرد هەڵگەڕام

"شەوەکان ڕەش دەکەمەوە".

گەڵاو گەڵا

چالاکانە دەچمەوە ماڵ

چالاکانە پێکێک لە دڵی خۆم هەڵدەدەم

ورد ورد تەنها بۆ یادگاری

لە نیشتیمان

مەرگ بە رستە وەدەکەم.

تەمموزی 2001 هەولێر

## ئێوارەیەک وەک درێژکراوەی رۆحم پڕ چاوەڕوانی

ئێوارەیەکی تەنیا
وڵاتێک پڕ لە نائومێدی
وەک ئەوەی بیابان لە گەڵادا بنوێ
ئاو بۆ پشودان لەم کۆبکاتەوە
من چاوەڕوانی دەمکوژێ
چاوەڕوانی باڵندەیەک
کە ئیتر بیر لە نیشتنەوە ناکاتەوە
کە ئیتر بە ئەندازەی فڕین
لە نیگەرانی رادەمێنێ
بە ئەندازەی نیگەرانی
خەیاڵم شەپۆڵ  شەپۆڵ
لە باران رادەکا

دڵۆپ  دڵۆپ

لە بێدەنگی دادەبەزێ

بێدەنگی

وەک درێژکراوەی چاوەڕوانی

بە مردنم دەسپێرێ

منیش ئەستێرە  ئەستێرە

بە نیگایەکەوە دەهاتمەوە

کە ساڵهایە ئەفسوون ڕەنگدەکا

بە نیگایەکەوە دەهاتمەوە

بە ئەندازەی نیشتیمان خەواڵوو

ئێوارەیەکی ماندوو

نیشتیمانێکی دیل

پڕ لە گێڕانەوەی بێدەنگی

بێدەنگی

وەک درێژکراوەی ئاسمان

دەمداتە دەست بیابان

لەوێ لە سەیر کردنی مانگ

خەیاڵم تووشی باخچەیەک دەبوو

باخچەیەک لە سەر بەرماڵی حەقیقەت

درەختە مەستەکانی بە دوای خۆیدا

کێش دەکرد

باخچەیەک وەک دوودڵی بنووسێتەوە دەڵێ:

دەنگی ئاو حیکمەتی تیایە

دەنگی ئاو

باران  باران

هێل بە ژێر پێتەکانی ژیاندا دەهێنێ

باران  باران

لە ژێر گەڵادا بێهودەیی کۆدەکاتەوە

ئێوارەیەک
وەک درێژکراوەی رۆحم
پڕ چاوەڕوانی
وەک نیشتیمان
نائومێدی تا خەیاڵی مەرگی بەرێت
مەرگ
وەک باران تەڕیکات

ئێوارەیەک
وەک ئەوەی فێرتکا
بڕوا بە یادەوەری بهێنی
کتو پڕ دەکەوتمە سەر هەوای بیرکردنەوە

## نیگای دەست ..............................

لە بەر دەم بیابان

ئەو وێنە خەوتووانەم بە نیگاوە هەڵدەواسی

کە باران

تا تاقیکردنەوەی مەرگ

بە سەریاندا نەدەفڕی

ئەو وێنانەی

کە ئاو تا سنووری پێکەنین

دەچووە گەروویانەوە

ئێوارەیەک کە ڕۆحم کزەی دێ

لە چاوەڕوانی

ئێوارەیەک کە نائومێدی بە پێکێ

بانگم دەکا

## نیگای دەست ...............................

ئێوارەیەک کە نیشتیمان

دادەبەزێتە نێو بازاڕ

لە شەڕی چاوەڕوانیدا

دیلم دەکا.

تەممووزی 2002 هەولێر

## دەشێ باران دڵدانەوەیەکی باش بێ

بۆ ئاو رستە یەکی تر لە ئەبەدییەت هەڵدەگرمەوە
ئەگینا بڕوا ناکەم باران بباریٚ
ئەگینا زۆر لەوە پیرتر
خۆم نیشان دەدا

زۆر لەو پیرتر
دەشآ دڵدانەوەیەکی باش بێ
لەچاوەڕوانی ئاو
لەچاوەڕوانی رستەیەک کە لە بەر باران
هەناسە دەدا
لەچاوەڕوانی گەڵا یەک کە بەر لە مردن
دەنوسێ باران.

ئاوو ئاو

لە ئەستێرەیەکەوە پیاسە دەکەین

تا دڵ حەز بکا تەنیا

تا چاو بڕبکا وێڵ

ئەستێرەیەک زۆر لەوە کزتر

بەرگەی دووبارە بگرێ

دووبارە عاشق بوون

باران ئەوەی نەگوت

وەک ئەوەی نەتوانێ شوێن  مرۆڤ بکەوێ

مرۆڤ ئەوەی نەگوت

وەک ئەوەی لە غەمی خۆی پەشیمان بووبێتەوە

بیابان رووت رووت

پەرییەک لە خەودا دەبینێ

باران بارن

دەکەوێتە دەریاوە

دەریا چەند دەبەنگ بێ

لە توانادایە جیهان بە ئارەزووی خۆی

چەندە جارەی باران بکاتەوە

ئاو چەند نەرم بێ

لە توانایدایە مرۆڤ مرۆڤ رابماڵێ

مرۆڤ چەند زۆر بێ

لە توانایدایە ژیان ژیان

دابەشی نائومێدی بکا.

باران باران

لە نائومێدی کۆ دەبینەوە

دەشێ ئاو دڵدانەوەیەکی باش بێ



بەڵام بیابان

لە ئەستێرەیەک دەهاتەوە

نزیک گومان

دەشێ بیابان دڵدانەوەیەکی باش بێ

بەڵام باران

رووت رووت

دەکەوێتە دەریاوە

پەرییەک لە خەودا دەبینێ

نەرم نەرم

زۆر لەوە دڵگیر تر

بەرگەی دووبارە بوونەوە بگرێ

زۆر لەوە دڵگیر تر

بەرگەی فەرامۆشی بگرێ.

بۆ باران رستەیەکی تر لەوانەی سەفەر دەچم

وەک ئەوەی کۆڵان  کۆڵان

نەخشەی رۆژ هەڵبدەمەوە

کۆڵان کۆڵان

ئاو ناپاکی لەئاو بکا

ئێوارە چڵ چڵ بشکێ.

ئیتر لەگەڵ ئاوە نا

لە زیندانێکەوە قسە دەکەم

دەڵێی بە باران چنراوە

لە کتێبێک کە سەفەر لەوپەڕی  پەشۆکاوی

حیکایەت دەکا.

لەوپەڕی نائومێدی

ژیان بە قەوزەوە

## نیگای دەست ..............................

گاز لە تەمەن دەگرێ
ژیان لە غروری من
دەریا دەیبا.

دەریا و دەریا
پەرییەک لە خەودادەبینم
وەک چرای باران دەپشکوێ
وەک چرای باران
بەر لەوەی بەیانی هەلوەرێ
نازی شەو هەڵدەدا
وەک چرای باران
بەرلەوەی ئێوارە بکەوێ
کز کز بەتاریکی تەرم دەکا
بەخەیاڵ دەڵێ بە ئاوم گوت

نەفرەت لە ئازایی ژیان

نەفرەت لە سەفەر.

ئاو بە رستەوە خۆی دەکوژێ

نەخشەی رۆژ زەرد هەڵدەگەرێ

باران چڵ چڵ خۆی بەنائومێدییەوە

هەڵدەواسێ

تەمەن وەک مانگ لە تەنیایم بزر دەبێ

منیش لەوپەڕی پەرگیڕی

لەگەڵ بیابان لم دەمبا.

دوور دوور

زیندانێک بە تاریکی دەناسێنم

بەر لەوەی لە کەناری بێهودەیی رووت بمەوە

پەرییەک دەبینم
نەرم نەرم وەک نیگەرانی دەبارێ
کتێبی گوڵ پەڕ پەڕ دەکا.

من دەڵێم باران ناباری
نائومێدی دەڵێ رەنگە
من سێبەری حیکایەتە مەستەکانی
حەقیقەتم
کتێبی گریانی شەوان
نائومێدی
من ئاو ئاو لە نائومێدی دێمەوە
سەفەر دەڵێ
شیعر بەشی ئەوە دەکا بڵێم تەنیام

من دەڵێم

وەک ئەوەی کتوپڕ تەمەن لە دڵۆپە ئاوێ

پەشیمان بێتەوە

کتوپڕ لە نائومێدی دەشکێم.

پیری و پیری

دەشێ باران دڵدانەوەیەکی باش بێ

دەشێ سەفەر دڵدانەوەیەکی باش بێ

دەشێ

دەشێ

من دەڵێم باران نابارێ.

تەمموزی 2003

**ژیان**

**ئاوو ئاو**

**دەڕوا**

بڵێم ئاو یان باران

قسە لە باران دێ

ژیان وەک باغی ئاو دەڕوا

نیشتیمان دەکوژێتەوە.

خوڕەی بیابان نییە

باڵندە وەک گوڵ دەبارێ

خونچە وەک ماچ

خورافاتی دەریا نییە

باران دەمرێ

لە ئاو زیندوو دەبێتەوە

خورافاتی باران نییە
ئەوە دنیایە بە ئارەزووی خۆی
دڵی ئاسمان
بە ناوی خوا
دووبارە تەنگ دەکاتەوە
دووبارە گیانم تەڕ دەبێ
باران دڵم تاڵان دەکا.

مرۆڤ دەبێ بە گزومانەوە
بۆ نیشتیمان هەنگاو بنێ

بڵێم ئاسمان یان ئاو
قسە لە باران ناکەوێ

## نیگای دەست ..............................

ئەوە دنیایە لە پەتجەم ئاڵاوە

ئەوە بارانە لە جەستەم دەبارێ

هەتا فەنابوون

ژیان دەڕوا

ئاوو ئاو

لە بەرامبەر کێشە گەرمەکانی مرۆڤ

لە بەرامبەر کێشە ساردەکانی ئاسمان

وەک باڵندە

دەنووک لە ئاسمان

گوڵ دەچنێ

چاو لە ئاسمان

دەچێتەوە پەنا ترس

بڵێم باران یان مرۆڤ
ئەوە دەریا نییە لە خەیاڵم
پەشیمان بۆتەوە
ئەوە پەنجەم نییە لە باران
بەجێدەمێنێ
وێنەیەکە کتوپڕ
لە مرۆڤ دەکا
کتوپڕ دەگریم
کتوپڕ
تا کۆڵانە چاو زەردەکانی بیابان
باران دەشکێ
تا خەیاڵی کزی وڵات
قەڵای بارانماڵی منە

## نیگای دەست ..............................

قسە لە باران دێ

ئاوو ئاو

ژیان دەڕوا

ئاوو ئاو

ساتمە لە تەنیایی دەکەم

کات: شپرپزەیە

لە چاوەڕوانی خوا درێژ دەبمەوە

تا بەهەشت

شەریعەتی ژیان بە باران وەدەکەم

کات: ورد ورد دەمبا

من: شپڕزەم

ئاسمان ئاسمان

لە نوری خوا دادەبەزم

ئاسمان ئاسمان

کۆتایی کێشەکان بە خەو دەکەمەوە

کۆتایی ژیان بە باران

بە شەو دەلێم

چەند دلۆپ شەونم راو دەکەی

تا ئەزەل چەند گوڵ دەچێنی

لە بیاباندا

ئاوو ئاو

تا کۆڵانە بێ قاچەکانی بیابان

قەڵای بارانماڵی منە.

کەسێک بە ژیان دەڵێ

قسە لە باران ناکەوێ

## نیگای دەست ..............................

مرۆڤ دەبێ بە ترسەوە

بۆ ژیان بچێ

مرۆڤ دەبێ

گەڵا گەڵا

لە دوای کزبوونی نیشتیمان پێک هەڵبدا

ئاوو ئاو

بمرم یان بخەوم

ئاسمان کێشە ساردەکانی تەواو نابێ

مرۆڤ کێشە گەرمەکانی لا تەواو نابێ

شەیتان دەژی

بمرم یان وەکو بەیانی

رابمەوە

باران لە ژیان نابێتەوە

دڵم لە چڕنووکی دەریا

ئاوو ئاو
هەتا فڕینی بیابان
هەناسەکانی نیشتیمان وەکو قژم
شانە دەکەم

هەتا کزبوونی نیشتیمان
ترس لە مرۆڤ نابێتەوە
پەنجەم لە ئاو.

باران وەک سوارچاکێکی ون
مرۆڤ مرۆڤ دێتە خوارێ

قسە لە باران دێ

ژیان لە رەگەوە خەو دەپیاتەوە

مرۆڤ لە رەگەوە ژیان ژیان

دابەشی تەنیایی دەکا

دنیا دەبێ بە مرۆڤەوە

بۆ ئاو بچێ.

مرۆڤ مرۆڤ

ئاو لە ژیان نابێتەوە

منیش دەڵێم

تا کۆڵانە بێ باڵەکانی بیابان

تا کۆڵانە چاو شینەکانی ئاسمان

قەڵای باران ماڵی منە

ئاوو ئاو

ژیان دەڕوا
ئاوو ئاو
رادەبمەوە
مرۆڤ لە رەگەوە هەڕەشە لە خەو دەکا
بیابان لە رەگەوە هەڕەشە لە ئاو دەکا
ئاسمان کۆتایی دیار نییە
مرۆڤ کۆتایی بە ئاو دێ
نیشتیمان وەنەوز دەدا.

ئاوو ئاو
قسە لە باران دێ
خەون درێژ دەبێتەوە وەکو مرۆڤ
دنیا درێژ دەبێتەوە چەشنی باران
مرۆڤ مرۆڤ

## نیگای دەست ..............................

ساتمەی لە ژیان دەکەم
دنیا دەبێ بە ئاوەوە
بۆ ژیان بچێ.

قسە لە باران نییە
ژیان زۆر ترسناکترە
ئێمە بە چاویلکەی باران سەیری بکەین
ژیان زۆر ترسناکترە
لە نائومێدی مرۆڤ بشکێ
ژیان دەبێ بە مرۆڤەوە
بۆ ئاو بچێ.

قسە لە باران دەکەوێ
ژیان لەولای نیگەرانی دادەبەزێ
ژیان لەولای نائومێدی

## نیگای دەست

حیکایەتێک بە پیتەکانی بیابان
هەڵدەواسێ
مرۆڤ دەڵێ
قەڵای باران ماڵی منە
باران دەڵێ
قەڵای ژیان ماڵی منە
منیش دەڵێم
مرۆڤ دەبێ بە ئاوەوە
بۆ ژیان بچێ
مرۆڤ دەبێ گەڵا گەڵا
دوای کوژانەوەی نیشتیمان
پێک هەڵبدا.

نیسانی 2004 هەولێر

